لەم دیوانەدا بە بەڵگەوە ساغم کردووەتەوە کە (کوردی) بە (١٤-١٥) ساڵێک بەر لە نالی لەدایکبووە، کەواتە ئەو پێشەوایە (کوردی)یە، سەرەڕای ئەوەی (کوردی) یەکەمین شاعیری سلەیمانی پایتەختی پاشایەتیی بابان بووە.
لەگەڵ ئەوەشدا بڕوام وایە کە نالی بەر لە ساڵی ١٢١٥ک=١٨٠٠ز لەدایکبووە، کە سەرچاوە چاپکراوەکان بەهەڵە ئەو ساڵەیان بۆ دیاری کردووە و (مەولانا خالید) یش (٥-٨) ساڵێک بەر لە (کوردی) لەدایکبووە و (شێخ مەعروفی نۆدێ) بە (٣١)ساڵ بەر لە (کوردی) لەدایکبووە و ئەم دوو شێخەیش شیعریان بە کوردیی سۆرانی هەیە.
لەمانیش کۆنتر (مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی بە (٦٠-٧٠) ساڵ بەر لە (کوردی) لەدایکبووە، شیعری هەڵبەستی بە کوردیی بابانی هەیە، بەر لەمیش مەلا محەمەدی حاجی حەسەن (ئیبنولحاج) بەر لەدایکبوونی (کوردی) بە ٢٥ساڵ نامیلکەی (مەهدینامە)ی بەهەمان (زارگوت=لەهجە)ی بابانی هەڵبەستووە کە (بێتووشی) و (نۆدێیی) قوتابیی ئەو بوون (ئیبنولحاج)یش بەلای کەمەوە (٨٠-٩٠) ساڵێک بەر لە (کوردی) لەدایکبووە.
محەمەد عەلی قەرەداغی لە لێکۆڵینەوەی نامیلکەی (مەهدینامە)دا کە لە چاپخانەی (کۆڕی زانیاری بەغدا) لە ١٩٧٥دا چاپ کراوە نووسیویە:
(ئیبنولحاج) یەکەم کەس بوو لە ناوچەی سلێمانیدا نووسینی کوردی فێری فەقێیەکانی کردووە کە لە مامۆستا کوردەکانی ئێرانەوە ئەو بە کوردی نووسینەی پێ زانیوە).
بێگومان بە کوردی نووسینی گەلێ گەلێ لەو مامۆستایانە کۆنترە کە شاعیر (کوردی) بەپێی بۆچوونی لایەنگرانی سێ کوچکەی بابان، دواترینی سێ کەڵە شاعیرەکە بێت و یەکەمی ئەو سیانەیش (نالی)یە و نالیش بەپێی تەمەن دوای کوردی لەدایکبووە کەواتە یەکەم و پێشەوای ئەو داهێنەری هەڵبەستی (زارگوت)ی بابانییە (کوردی)یە نەک (نالی)، ئەگەرچی (نالی) پێشەوای هونەری وێژەی بگرە نەتەوە ئیسلامییەکانیش بووە.
ئەو (نالی)یە کە گوایە داهێنەری هەڵبەستی (هەرێمی بابان)ە کە لە سەردەمی (کوردی)دا ژیاوە و ئەو (کوردی) یە بێ پەروا لە نالی لە هەڵبەستی ژمارە (٦١)یدا فەرموویەتی:

(کوردی! دلێری عەرصەیی نەضم و فەصاحەتە
جەولان دەکا هەمیشە وەکو بەرقی تیژڕەو).

ئەمەتا (کوردی) بەبێ پەروا بەرامبەر نەک هەر (نالی) بەشکو بەرامبەر بە هەموو شاعیرانی تریش ئەوەی گوتووە.
(حاجی قادری کۆیی)یش سەد ساڵ پترە لە چامە درێژەکەیدا لەمەڕ شاعیرانی کوردەوە (کوردی)ی بە:
(شاسواری بەلاغەت و فەصاحەتی بابانی و بە پۆشتەکەرەوەی پەیکەری هەڵبەستی کوردی بە (غەزەلی خۆی)و بە گیان بەبەراکەرەوەی (بەیتی شیعری کوردی) و ناوچەی بابان داناوە، کە پێشەوا و داهێنەر دەگرێتەوە و ئەسپی یەکەتازی خۆی (کوردی) پێش نالی خستووە.
(حەمدی) لە چوار باڵییەکەیدا بە ڕاشکاوی:
(خەرمانی زمانی کوردی بە (کوردی)ی شاعیر هەڵگرتووە و دوای هاوار و ناڵەناڵکردنی (نالی)یە و ئەمجا لەو خەرمانە (کاسەیەکی) بەخشیوە بە (نالی)، وەک لە باسی: (کوردی) (حەمدی)دا نووسیویە و دەبێ ئەوە بزانین (حەمدی) ئەوەندە ڕاستگۆ بووە کە دیوانەکەی بە دەیان بەڵگەی ڕاستگۆییەکەی تیایە و لەو چوارینەیەیدا لایەنی خزمایەتیی خۆی (کوردی) ی نەگرتووە، زمانی شیعری کوردی زمانی بازاڕ بووە، نەک هی مزگەوت، کەواتە هەرێمی بابان بەر لە سێ کەڵەشاعیرەکەمان هەڵبەستی تێدا هاتووە و ئەو سێ شاعیرە پێشەواترین شاعیری بوون و (کوردی)یش یەکەمی ئەو سێ شاعیرە بووە، کە لایەنگرانی سێ کوچکەی بابان، مافی (کوردی)یان پێشێل کردووە.



## هاندەرانم لە کاری ئەم دیوانەدا:

لە چلەکانی چەرخی بیستەمی زایینی بەملاوە، گەلێ لە مامۆستایان و دۆستانم پێیان زانیوە کەرەستەیەکی زۆری ئەم دیوانەم گرد کردووەتەوە، ئیتر هەموویان هەمیشە هانیان داوم کە هەرچی زۆرتر (لەز) بکەم لە گەیاندن بە چاپ، هەرچەندە ئەوسایەش ئەوەندەی ئێستا کەرەستەم نەبووە و ساڵ لە دوای ساڵ ئەم دیوانەم پڕتر و پۆشتەتر کردووە، لەدوای ئەم ڕستەیەوە بەپێی یەکەم پیتی هیجایی سەرەتای (ناو) یان (نازناو)ی ئەو کەسانە ڕیز و پێشکەش دەکەم کە:
دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین، جەمال عەبدولقادر بابان، سەبری بۆتانی، بەختیار زێوەر، فایەق بێکەس، عەبدولڕەزاق بیمار، حەسەن عەباس جاف، محەمەد جەلال حەیدەری، عەبدوڵڵا (زێوەر)، عەلائەدین سەجادی، شاکیر فەتاح، مامۆستا مەلا فەرەجی واژەیی (شەکیب)، ئەحمەد شوکری، محەمەد عەلی قەرەداغی، عەلی باپیر ئاغا، قانیع، گۆران، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، گیو موکریانی، محەمەدی مەلا کەریم، هەردی، محەمەد سەعید بەگی جاف، (هەژار) و...
لەناو ئەو بەڕێزانەشدا:
یەکەم- محەمەد عەلی قەرەداغی کە یاریدەدەری سەرەکیم بووە لە ژیانمدا و لە لێکۆڵینەوەی ئەم دیوانەدا.
دووەم-مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە زوو زوو سەریم دەدا و ئەویش لە ماڵەوە سەری دەدام.
سێیەم- جەمال بابان جگە لە هاندانی زۆرم و لە کاتێکدا کە

(بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی) بوو لە بەغدا، بڕیاری ڕەسمیی دا بۆ لەچاپدانی ئەم دیوانە.
چوارەم- حەسەن عەباس جاف، سەرەڕای هاندانم ئامادەیی خۆی پێڕاگەیاندم کە ئەگەر پێویستم بەپاکنووس بێت بۆم پاکنووس دەکات.
ئەو هەموو بەڕێزانە خۆشبەختانە ماون و هەر تەمەن درێژ و کارا بن، هەندێکیشیان خوا لێیان خۆش بێت.

## یاریدەدەر ترینم:

یاریدەدەری سەرەکیم لەبەرهەمهاتنی ئەم دیوانەدا، مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی بوو، ناوبراو جگە لەوەی تاکە پشتگیرێکی کۆڵنەدەری نەبوونیم بووە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ز.دا، کە بەناسینی بەهرەوەر بووم و تا ئێستاش پەیتا پەیتا هەڵبەستی (کوردی) پێگەیاندووم لە کەلەپوری نەتەوایەتیماندا بەدەیان کەشکۆڵ و بەیازی دانسقە و سەرچاوەی چاپکراو لەپەڕاوی و گۆڤار و ڕۆژنامەی بەدەستیاو پێ داوم، دوای ئەوەی پێویستی خۆمم لەبەر نووسیونەتەوە بە سوپاسەوە بۆم گەڕاندوونەتەوە، ئەو بەڕێزە خەباتکارە کە پتر لە نیو سەدەیە عەوداڵی کۆکردنەوەی کەلەپووری گەلەکەمانە و لەسەری نووسیوە، لەو کارە پیرۆزەی خۆیدا لەهەر لایەک و لەهەر پەڕاوخانەیەکی تر و بە هەڵبەستی (کوردی)ی زانیبێت، گورج لەسەر کیسەی خۆی بۆی ئامادە کردووم و پێی داوم و وەڵامی هەر پرسیارێکی ئایینی و وێژەیی و مێژوویی منی بە پڕ وچڕی داوەتەوە.
ناوەڕۆکی ئەم دیوانە لە سەدان شوێنیدا گەواهیدەری ئەم ڕاستییانەی سەرەوەن کە بەناوی خۆیەوە و بە سوپاسەوە، جێگیر کراون، هەمیشەیش لە پێشەوەی هاندەرە بەجەختەکانی ئەم ڕێگەیەم بووە و دەستی لێ بەرنەداوم، هەتا لە (ئاراس)ی لە شکۆمەندترین دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ناوچەکەدا، لەوەبەریش چەندین هەواڵی ئەم لەچاپدانەی بەجێ گەیاندووە، ئەگەرچی دیوانەکەی تیا کەوتووەتە گێژە و لەوانیشی دەرباز کردووە.
لە پێزانینمدا بەرامبەر بەم هەموو هەوڵ و کۆشش و هەڵوێستە مرۆڤایەتی و ئیسلامی و نەتەوایەتی و زانیارییانەی ئەم مامۆستا بەڕاستی مەزن و دڵسۆزەم، هەرگیز یارای سوپاسگوزاریم بە دەم و بە نووسین و بە کردەوە نییە و لە خوای گەورە خوازیارم کە بەرخوردار و تەمەن درێژ و تەندروست و کامەرانی بکات و پڕاوپڕی ئارەزووی خۆی پڕ بەرهەمتر بێ و بە ئاواتی خۆی بگات.

## گرنگترین سەرچاوەم:

ئەم دیوانە لە سەدەها سەرچاوەی بەدەمی و دەسنووس و چاپیی گرنگ و بایەخدار و لە نرخ نەهاتوو، بەدی هاتووە، گرنگترینی هەموانیان جووتە کەشکۆڵە دەستنووسە نایاب و دانسقە دەگمەنەکەی (عەلی ئاغای نەوتچی)ی زەنگەنەیی و براکەی حسەینەڕەش (قەرەحسەین) سەرۆکی خانەوادەی نەوتچییانی کەرکوک بوو.
لەو جووتە کەشکۆڵەدا چەندین هەڵبەستی (کوردی) و دەسنووسی خودی (کوردی)ی نووسراون کە (ئاغا) لە کەشکۆڵێکی محەمەد فەیزی ئەفەندی (موفتی زەهاوی) یەوە وەری گرتوون.
ئاغا زۆربەی هەڵبەستەکانی (کوردی) و شاعیرانی تری لێک داونەتەوە و بەقووڵی چووەتە بنج و بناوانیانەوە، بۆنە و کات دانانیان و وردەکاری و یاریی بەو وشەکردنەکانیانی شی کردوونەتەوە کە وەک کلیلی دەرگای گەنجینەی پڕ نهێنی زانیارییانەی کەلەپووری و وێژەیی و مێژووییمان.
لەم لیستەی سەرچاوەکانی ئەم دیوانەدا ئەو دوو کەشکۆڵەم بە (عن) نیشانە کردووە، هەردووکیانم لە سلەیمانی لە جەمیل ئاغای برای (عەلی ئاغا) وەرگرتوون، کە لە نیوەی دووەمی سییەکانەوە هەتا پەنجاکانی چەرخی بیستەمی زایینی (ئەمینداری خەزێنەی سلێمانی) بووە و دوایی لەبەر نووسینەوەی ئەوەی پێویستم بووبێ لەو ماوەیەدا لەبەریانم نووسیونەتەوە، لەدوای خانەنشینکردنی جەمیل ئاغا بە کەشکۆڵەکانەوە گەڕایەوە کەرکوک.
بەداخەوە (هەردوو کەشکۆڵەکە کەوتبوونە دەست کوردێکی لەخۆگۆڕاو (تەرزی باشی)و گورج لەناو دراون).

## لێکورتکرانەوەی ئەم دیوانە:

لەم دیوانەدا سەرپاکی (وشە)ی فەرهەنگی و ناوی کەسان و شوێن و شت و کارەسات، زاراوەکانی سۆفیگەری و وێژەیی و زانیاری و کەلەپوور و دیاردەی ئایینی لە ئایەت و حەدیس، بەپێی هەموو فەرهەنگە کوردییەکان و هەندێ لە فەرهەنگی زمانە بێگانەکان و پەڕاوی، ئینسکلۆپیدییەکان و سەرچاوە دەسنووس و چاپکراوەکان لەپەڕاوخانەکەی خۆمەوە لە هەموو لایەنێکەوە و داڕشتن و نووسین و نیشانی خۆم بوون و بەس بە پاکنووس و زۆر بە درێژی نووسیومن.

## پێڕستی سەرچاوەکان:

أ-کەشکۆڵی دەسنووسی ئەوقافی سلێمانی محەمەد عەلی قەرەداغی لە (زستانی ۱۹٦۰)ز.

ئا-ئەنجومەنی ئەدیبان-ئەمین فەیزی بەگ-چاپی کاکەی فەلاح.

ب-کەشکۆڵێکی کۆنی دەسنووسی عـەبـدولـڕەزاق بیمار (۱۹٦۱)ز.

با-کەشکۆڵێکی دەسنووسی عەلی باپیر ئاغا (کەمالی) کە لە پایزی ۱۹٤۷ز.دا لە هەڵەبجە بۆ من (حەمەبۆر)ی نووسیویەوە.

با/۱- (حەوت بەند)ە فارسییەکەی مستەفا بەگی کوردی کە (کەمالی) بۆ (حەمەبۆر)ی نووسیوەتەوە.

بح-کەشکۆڵی (بیرەوەری و بژار) دەسنووسی (حەمەبۆر) کە لە زستانی ۱۹٤۰ز.دا نووسراوە.

بل-کەشکۆڵێکی کۆ دەسنووسی (بلال المحمدی).

بم-کەشکۆڵێکی کۆنی مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار کە محەمەد ئەمین ناوێک نووسیویەتیەوە.

ج-نامیلکە لێکدانەوەکەی (حەوت بەندە)ە فارسییەکەی (کوردی) محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، چاپی ڕۆنیۆ /۱۹۹۸ز.

جەلی-کەشکۆڵە کۆنە پەڕە پەڕە دەسنووسەکەی خانەوادەی (جەلی زادە) کە (نەجیبە خان)ی خوشکی مەسعود محەمەد جەلی زادە پاراستوویە.

جم-دەسنووسی (حەوت بەند)ە فارسییەکەی (کوردی) کە هی خانەوادەی موفتی سلەیمانی و لای مامۆستا جەمال موفتی بوو.

ح-کەشکۆڵی دەسنووسی (شێخ حەسیب بەرزنجی) لەساڵی ۱۳۲۲-۱۳۲٦ک=۱۹۰٤-۱۹۰۸ز.

حا-کەشکۆڵە بەناوبانگ و دەسنووسەکەی (مەحموود پاشای جاف).

حب-کەشکۆڵی دەسنووسی شێخ حەسەنی بەرزنجی و هی (موفتی پێنجوێنی) لە بەهاری ۱۹٤۰ز.دا لە پێنجوێن کەڵکم لێ وەرگرت.

حص-دیوانی ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان چاپی مامۆستا جەمال محەمەد ئەمین.

حم-کەشکۆڵی (پـەڕاوی سەنگین و شەنگ) دەستنووسی (حەمەبۆر) ۱۹۳۹.

دس-کەشکۆڵێکی دەسنووسی شاعیر (شێخ سـەلام) لە ۱۹۲۹ز.د نووسویەتیەوە، لە ۱۹۳۹ز.دا کەڵکم لێ وەرگرتووە.

دو- (دیوانی وەفایی) ئامادەکردنی محەمەد عەلی قەرەداغی.

ر-ئۆفسێتی کەشکۆڵی دەسـنـووسـی مامۆستا مەلا ڕەسوڵی تۆربەیی لە ساڵی ۱۳۱۰-۱۳۱۲ک=۱۸۹۲-۱۸۹٤ز نووسیویەتیەوە.

ژ-ڕۆژنامەی (ژین)ی پیرەمێرد لە ناوەڕۆکدا ژمارە و ڕۆژی نووسراوە.

س-ئۆفسێتی چاپی (۲/گیو) ی (دیوانی کوردی) کتێبفرۆشیی سەیدیان-ی مەهاباد لە (پاکستان) چاپی کردووە.

س/۱ (دیـوانـی سالم) چاپی کـوردی و مەریوانی ۱۹۳۱ چاپخانەی (ئیتام).

س/۲ (دیوانی سالم) چاپی ۲ی _گیو).

سا-مێژووی ئەدەبی کورد-عەلائەدین سەجادی ۱۹۵۲.

سجا-حەوت بەندە فارسییەکەی (کوردی) کە عەلی باپیر ئاغا (کەمالی) لە ۱۹٤۱ز.دا بۆ عەلائەدین سەجادیی نووسیویەتیەوە.

ش-کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا عەزیزی ڕێشاویی لە محەمەد عەلی قەرەداغیم خواست.

شح-کەشکۆڵێکی کـۆنـی دەسـتـنـووس کـە هـی (مـەلا عەبدولڕەحمانی بانەیی) بوو کە لە ۱۹۳۸ز.دا چەندین جار لێم وەرگرت.

شک-دیوانی شوکری فەزڵی دەسنووسی (حەمەبۆر) لە ۱۹٤۰ز.

ص-کەشکۆڵی (صەدباری) محەمەد عەلی قەرەداغی.

ص/۱کەشکۆڵی دەسنووسی (صەدباری) محەمەد عەلی قەرەداغی.

ص+کەشکۆڵی دەسنووسی (ئەمجەد حەسەن صەدباری) محەمەد عەلی قەرەداغی.

صح-دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقڕان، دەسنووسی نەجمەدین مەلا.

ط- (حـەوت بەند)ە فارسییەکەی (کـوردی) سەید تاهیر هاشمی.

ع-کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا عەزیزی بالیکەدەری کە لە کۆڕی زانیاری بەغدایە.

عب-چامە نیشتمانییەکەی (سالم) لەبارەی ڕووخاندنی پاشایەتی بابانەوە، بە دەسنووسی کۆن (عەبدولڕەزاق بیمار).

عق-کەشکۆڵێکی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای قزڵجی لە ساڵی ۱۳٤۲ک=۱۹۲۳ز.دا نووسیویەتیەوە.

عـن-دوو بەرگی کەشکۆڵە دەسنووسەکەی عەلی ئاغای نەوتچی کە لە ساڵانی ۱۲۹٦-۱۳۱۳ک=۱۸۷۸-۱۸۹۵ز.دا نووسیونیەوە، ئەم دوو کەشکۆڵە بەر لە مردنی کوردی بە ۱۹ساڵ نووسراوەتەوە و گرنگترین پەراوێزی مێژوویی و وێژەیی لەسەر شیعرەکانی (کوردی)ی نووسیوە.

ف-دیوانی شاعیر فیکری دەسنووسی (حەمەبۆر) لە ساڵی ۱۹٤۰ز.دا.

فح-کەشکۆڵی دەسـنـووسـی مـەلا فەتاحی کاگردەڵێ، (م.قەرەداغی).



فح/١كەشكۆڵی هەمان نووسەر.
ق
ق/١
ق/٢ پێنج کەشکۆڵی ئۆفسێت هی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی
ق/٣
ق/٤
ک- پەڕاوی شاعیرە لەبیرکراوەکانمان چاپی عەلی باپیر ئاغا (کەمالی).
ک/١کەشکۆڵی دەسنووسی شاعیر (شێخ عەبدولرەحمان کاکە-نسیب) لە ساڵانی ٢٠و٣٠ یەکانی چەرخی پێشوودا نووسیویەتیەوە.
کا- دیوانی هەمان شێخی ناوبراو.
کش
کش/١
کش/٢ پەڕەپەڕەی پاشماوەی ٣ کەشکۆڵی پەرپووت و دڕاوی (محەمەد عەلی قەرەداغی).
کم- یەکەم چاپی (دیوانی کوردی)ی کوردی و مەریوانی ١٩٣١ز.
کو- کەشکۆڵێکی پەڕاویخانەی کۆڕی زانیاری بەغدا کە مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ پێشکەشی بە کوڕی کردووە.
گ- چامەکەی (سالم) لەمەڕ ڕووخاندنی پاشایەتی بابان لە گۆڤاری گەلاوێژدا.
گ/٢
گ/٣دیوانی (کوردی) چاپی مامۆستا گیو موکریانی چاپی (٢)و چاپی (٣).
گل- کەشکۆڵی دەسنووسی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵەیی ١٢٨٢ک=١٨٦٥ز کە لە قەبارەی (بەیاز)ی بەرباخەڵدایە.
گل/٢- مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵە کە لە١٣٠٠ک=١٨٨٢ز. دا نووسیویەتیەوە.
گل/٣- دەسنووسی هەمان گەلاڵەییە لە ١٣٠٢ک- ١٨٨٤ز.دا و هی مستەفا ئەفەندی حاجی ئەحمەدی فاتێی کەشکۆڵنووس بوو.
گل/٤- دەسنووسی هەمان گەلاڵەییە لە ١٣٠٦ک=١٨٨٨ز.دا.
گل/٥- هەمان گەلاڵەیی لە تەکیەی شێخ مارفی سلێمانی لە ١٨٩٠ک=١٨٨٨ز.دا نووسیویەتیەوە.
گل/٦- کەشکۆڵی هەمان گەلاڵەیی بوو کە لە ساڵی ١٣٠٩ک=١٨٩١ز.دا هی شێخ ڕەئوفی شێخ محەمەدی حەفید بوو.
گل/٧- هەمان گەلاڵەیی لە ١٣١٠ک=١٨٩٢ز.دا نووسیویەتیەوە هی عەلی کەمال باپیر ئاغا (کەمالی)بوو.
گل/٨- هەمان گەلاڵەیی لە ١٣١٠ک=١٨٩٢ز.دا نووسیویەتیەوە (مەلا ئەحمەدی حاجی رەشید).
گل/٩- دەسنووسی هەمان مامۆستا بوو ١٣١٧ک=١٨٩٩ز.دا هی مەلا مستەفای ئیمامی مزگەوتی کانی ئاسکان بوو.
گل/١٠- هەمان گەلاڵەیی لە چەند ساڵی جیاجیادا نووسیویەتیەوە لە ساڵی (١٣٠٠ک)ەکاندا.
م- کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵڵا موفتی پێنجوێنی کە دەسنووسی خۆی بوو.
ما- کەشکۆڵی دەسنووسی محەمەد ئەسوەد.
ما/١- کەشکۆڵی دەسنووسی محەمەد ئەسوەد.
مدرس- کەشکۆڵی دەسنووسی محەمەد ئەسوەد.
مدرس= ئۆفسێتی کەشکۆڵێکی دکتۆر کەمال فوئاد بوو، بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی ناردووە.
مدرس/١- کەشکۆڵێکی نووسینی قەبارەی ٥, ٥×١١سم ١٢٠ لاپەڕە، بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.
مر- کەشکۆڵێکی مەلا عەبدوڵڵا ڕەشەکانی کە لە ١٩٢٠ ز بەدواوە بۆ خۆی نووسیویەتیەوە.
مس- کەشکۆڵێکی نەوەی سەیدیی هەورامی دووەم کە هی نەوەیەکیانە (محەمەد) ناوە، لە ساڵی ١٢٥٠ک=١٨٣٤ز.دا بۆ مەلا محەمەد ناوێکیان نووسیوەتەوە.
مح- کەشکۆڵێکی دەسنووسی مەلا عەبدوڵڵای ڕەش (پشدەر)ی کە لە ١٣٠٨ک=١٨٩٠ز.دا نووسیوەتیەوە.
مک- ئۆفسێتی کەشکۆڵی (موعەممەری کاشانی) سەید تاهیری هاشمی لە ساڵی ١٩٦٣ز.دا لە تارانەوە بۆ حەمەبۆری ناردووە کە (حەوت بەند)ە فارسییەکەی، کوردیشی تیایە.
ن- کەشکۆڵێکی کۆنی دەسنووسی کە گەلێ هەڵبەستی تیایە و ٢٣ ساڵ دوای مردنی کوردی نووسراونەتەوە.
ئەو کەشکۆڵە هی نامیق ئاغای مستەفا ئاغای حاجی حەسەن بوو.
نا- (دیوانی نالی) چاپی کوردی و مەریوانی.
نح (دیوانی نالی) چاپی عەبدولکەریمی مودەریس و کوڕانی.
نگ- دیوانی نالی چاپی گیو موکریانی.
نم/١- کەشکۆڵی (مینای شکستە) بەرگی/١ دەسنووسی نەجمەدین مەلا بوو، بۆ (حەمەبۆر)ی نووسیوەتەوە لە ١٩٣٩.
نم/٣بەرگی سێیەمی کەشکۆڵی پێشوو.
نن- کەشکۆڵی نووسراوە (پەرێشان)و دەسنووسی نەجمەدین مەلا.
و- دیوانی وەفایی کۆکردنەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی.
و/١- دیوانی وەفایی چاپی یەکەم- گیو موکریانی.
و/٢- دیوانی وەفایی چاپی دووەم- گیو موکریانی.
ه- کەشکۆڵی دەسنووسی (حەمەبۆر) بەناوی (هونەرگە).
یح- ئۆفسێتی کەشکۆڵێکی (دانشکدە تهران) کە سەید تاهیری هاشمی بۆی ناردووم، (حەمدوون) پاکنووسکراوی پەڕاوی مەلا حەمدوونی شاعیر و زانای کورد، لێکۆڵینەوەی (حەمەبۆر) و محەمەد عەتا.

# مستەفا بەگی کوردی.....
# لێکدانەوەی شیعر و ژیان

**عەبدولموتەڵیب ئەحمەد**

مستەفا بەگی کوڕی مەحموود بەگی ساحێبقڕان، ناسراو بە کوردی، لە ساڵی ١٨١٢ز لە سلێمانی لەدایکبووە، هەر لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٥٠ز کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە. شاعیر وەکو منداڵانی سەردەمەکەی خۆی لە حوجرە فێری خوێندەواری بووە، بەڵام درێژەی بە خوێندن نەداوە بۆ ئەوەی ببێتە مەلا. مستەفا بەگی کوردی، بە یەکێک لە کۆڵەکەکانی قوتابخانەی شیعری بابان لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام بەداخەوە بەرهەمێکی کەمی شاعیر کەوتۆتە دەست خوێنەران، جگە لەوەش کە ناوی شاعیر لەتەک نالی و سالمەوە دێت، بەڵام وەکو پێویست ئاوڕی لێنەدراوەتەوە.

## لایەنی شاراوەی ژیانی کوردی

گەلێک لایەنی شاراوەش هێشتا پەردەی لەسەر هەڵنەدراوەتەوە، ئەوەش وایکردووە گەلێک شتی ئەفسانە تێکەڵ بە ژیانی مستەفا بەگی کوردی بکرێت، کە هیچ بنچینەیەکی زانستیی نییە. گوایە مستەفا بەگ عەشقی قادر ناوێک بووە، ئەو قادرە بۆتە* سەرچاوەی ئیلهامی شیعری مستەفا بەگ. دەگێڕنەوە کە مستەفا بەگی کوردی بە شای ئێران گەیشتووە، لەگەڵ قائانیی شاعیری گەورەی ئێران شەڕە شیعری کردووە، شای ئێران گەلێک سەرسام بووە بە مستەفا بەگی کوردی، گەرچی ئەو گێڕانەوەیە جێگەی گومانە و عەقڵی مرۆڤ بۆی ناچێت کابرایەکی کوردی خەڵکی بابان بگاتە شای ئێران و لەوێ لە مەجلیسی شادا کابرایەکی سونیی مەزهەب، هێرش بکاتە سەر مەزهەبی شاه قائانیی شاعیر، بەڵام هەر چۆنێکیش بێت، ئەوا هەرگیز لە شاعیریەتی و هەڵوێستی مستەفا بەگ کەمناکاتەوە، بەڵام مستەفا بەگ کە ئاوارەی ئێران کرابێ، ئاسان نییە بگاتە شای ئێران، جگە لەوەش لە دیوانەکەی کە ئێستا لەبەردەستدایە، هیچ ئەوە نادەنە دەست کە گەیشتووەتە کۆشکی شاهانە و شەڕەشیعری لەگەڵ قائانیدا کردبێت. ناوی قادر گەلێکجار لە هۆنراوەکانی کوردی بەکار هاتووە، بێ ئەوەی بە تەواوی ساغ کرابێتەوە ئەو قادر ناوە کێیە؟


پەیکەری (مستەفا بەگی کوردی)- پەیکەساز بەرزان زاهیر

## وەسف لای کوردی و تێکەڵیی

### شیعریی بە ئایین

ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە کوردی هەوڵی ئەوەی دابێت کە عەشقی مەجازی بگۆڕێت بۆ عەشقی حەقیقی، دەکرێت بڵێین، ئەو قادرە مەبەستی لە ڕێبازی قادری بێت، گەرچیش هیچ تروسکاییەک نییە کوردی لەسەر ڕێبازی قادری بێت و ڕێبازی سۆفیزمی گرتبێتەبەر، کەواتە تەنها تاکە ڕێگەیەک دەمێنێتەوە کە بڵێین، زۆر نزیکە ئەو قادر ناوە، ناوی ئافرەتێکی خۆشەویستی خۆی بێت، بەڵام وەکو ڕەمزێک بەکاری هێنا بێ، ئەویش لەبەر ئەوەی باروزروفی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە ڕێگەی نەدابێ بە ئاشکرا ناوی بهێنێ. جوانی پانتاییەکی فراوانی لە شیعرەکانی کوردیدا داگیر کردووە، زۆربەی ئەو جوانییەش بە یوسفی کوڕی یەعقوب چواندووە، لەوەوە بەدیار دەکەوێت کە مستەفا بەگ ئەگەرچی مەلا نەبووە، بەڵام ڕۆشنبیریی ئایینی هەبووە و کەوتۆتە ژێر کاریگەری کارەسات و ڕووداوە ئایینییەکان، ئەوە باس لە جوانی حەزرەتی یوسف و زولەیخا دەکات، کە چۆن زولەیخا عاشقی جوانی یوسف بووە و خۆی تەسلیم بەو کردووە، کاتێکیش خەڵکەکە بەوەیان زانیوە، سەرزەنشتی زولەیخایان کرد، ئەویش بۆ ئەوەی قەناعەت بە خەڵکەکە بهێنێ و پاکانەی خۆی بکات، خەڵکەکەی داوەت کردووە، هەریەکەیان چەقۆ و سێوێکی داوەتە دەستیان، پاشان یوسفی پێ نیشاندان، ئەوانیش لە تاوی جوانی یوسف ئاگایان لەخۆ بڕا و دەستی خۆیان بە چەقۆ بڕی و گوتیان: (انی لاجد ریح یوسف لولا ان تفندونی) (یوسف ٣١)

کوردی دەڵێ هەرکاتێک یوسف جوانی بەدیار کەوت من زانیم کەوا عەشقی ئەو دەبێ:





**که شوعلەی طەلعەتی یوسف طلوعی کرد که چەه زانیم**
**که عیشق ئەز پەردەیی عیصمەت بیرون ئارەد زولیخا را**

دیسان له وەسفی جوانیدا دەڵێت، ئەگەر حۆرییەکانی بەهەشت خۆیان له ئاوی کەوسەر بشۆنەوە، هەرچی پیسیی هەیه فرێی بدەن، ئەوا بە فال و ڕەنگ و ڕوخسارت حاجەت بەڕووی یار ناکات، چونکه ناگەن بەتۆ.

ئەگــەر حۆری له کەوثەر شوستوشۆی خۆی بەتــۆ نابــێ
بە ئاب و ڕەنگ و خاڵ و خەت چ حاجەت ڕوویی زیبارا

کاتێک که حەزرەتی یوسف له باوکی دوور کەوتەوه بۆ وڵاتی میسر، باوکی واته حەزرەتی یەعقوب، له تاو دووریی یوسف چاوەکانی کوێر بوون، بەڵام پاشان حەزرەتی یوسف کراسەکەی خۆی نارد و بەسەر چاویاندا هێنا، چاوەکانی حەزرەتی یەعقوب چاک بوونەوە، جا پێش ئەوەی قاسیدەکه بێت، حەزرەتی یەعقوب گوتی: (اتری الله یحی هذا العظام بعد مارمت) (یوسف ٩٤). کوردیش دەڵێت، گەر بێتو جارێک بەلاماندا تێپەڕبێت، ئەو تێپەڕبوونه وەکو کراسەکەی حەزرەتی یوسف بۆ من که تارمایی دڵ و دەروونم بڕەوێتەوە و ڕۆشنایی بۆ چاوەکانم:
**قمیصی یوسفه بۆ چاوی تاریکم وەکو یەعقوب**
**سەبا جارێک بەلاما بێنێ گەر بۆی عەرەقچینت**
**ئەمجاره به پێچەوانه شاعیر دەڵێت من وەکو حەزرەتی یوسف چۆن کراسەکەی نارد بۆ باوکی و چاوەکانی ڕووناک بوونەوە، تۆش هیمەت بکه وەکو شیفا به دیدارت شادبم و چاوەکانم ڕووناک ببێتەوە:**
**کوێر بووه وەکو یەعقوب به خودا دیده له بۆت**
**سا بنێره وەکو یوسف به شفای دیده له بۆت**

ئەگەر بێتو تۆش وەکو حەزرەتی یوسف خۆت کەنارگیر بکەی، که بێ تاوان بوو، چەند ساڵان خرایه بەندیخانەوە، ئەو کاته دەماری عیشق و ڕیشی به تۆ هیمەت لەگەڵپارچەی کەلێنی یەخەی کراسەکەی، چونکه کاتێک زولەیخا هەوڵی ئەوه دەدات یوسف تەسلیمی بێت، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، زولەیخا کراسەکەی ڕاکێشا:
**ئەگەر بێتو به ناحەق بۆت بکەی پەنهان وەکو یوسف**
**وەریدی عیشق و ڕیشی تۆ هەمەت و چاکی گریبانی**
شاعیر بێزاریی خۆی دەردەبڕێت له دەست عەشق، بەڵام هیچ کەسێک له عاشقایەتیدا موخەبەر نییه، له دەسەڵاتی خۆیدا نییه، کەوایه با ئەو کەسانه که عاشقن، یاخوا له زوڵەیخا خراپتر و شێت و شەیداتر بن، چونکه زوڵەیخا گەلێک عاشقی یوسف بوو، شێت و شەیدای ببوو:
**کەس له ڕەویەی عەشق و ڕێگەی عاشقی موخییر نییه**
**شێت و شەیداتر ببوایه زوڵەیخا کاشکێ**
شاعیر سوێند دەخوا به جوانی حەزرەتی یوسف که له جوانیدا وێنەی نەبووە، هەر ئەو حەزرەتی یوسفه که نووری چاوەکانی حەزرەتی یەعقوبی باوکی بوو، هەر لەبەر یوسفی کوڕی کوێر بوو، هەر به کراسەکەشی چاوەکانی چاک بووەوە:

**بەحسنی یوسف ئاسات و به خولق و لوطفی شیرینت**
**چراغی بەزمی خوسرەو نووری دیدەی پیری کەنعانی**

زوجەوشەن سەر لەشکری سوپای یەزیدی کوڕی معاویه له نزیک شاری کەربەلا، هێرشی کرده سەر حوسێنی کوڕی عەلی و هەموویانی شەهید کرد، بەو شێوەیە:

**خوێنی شەهیدان تا ڕۆژی حەشر ئەتکێ له نێوان موژگانت**
**وەک خەنجەری زی جەوشەن تا ڕۆژی حەشر دەتکێ**
**خوێنی دڵی مەزڵومان له ناوکی موژگانت**
ئۆبەی کوڕی خەلەف، پارچه هێسکێکی به دەستەوه بوو، به گاڵتەوه به پێغەمبەری خوا (د.خ) دەڵێ کێ ئەو هێسکه زیندوو دەکاتەوه (اتری الله یحی هذا العظام بعد مارمت) پێغەمبەریش (د.خ) فەرمووی (نعم یبعثک الله و یدخلک الجهنم) هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (قال من یحی العظام وهی رحیم) (یاسین)، کوردی دەڵێت، گەیشتنی تۆ زیندووم دەکاتەوه، هەروەکو چۆن هێسک یەکدەگرێتەوه هەتا ئەو کاتەی لاشەم دەبێته گەردو تۆز خاک، ئەو گەردەش هەموو به دەم بای شەماڵەوه دەفەوتێ:
**وەصلی تۆ (یحی العظام) و قالبی فەرمووودەمە**
**بێله تۆ بۆ خوا بلا شاد بێ بەگەردم بای شەماڵ**
تۆ پەرییەکانی بەهەشتی که هێنده جوانی، یاخود تۆ گوڵێکی له گوڵه جوانەکانی باغی ئیرەم، یاخود ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی، یاخود ئەو ڕۆژه به تیشکەی که هەموو زەوی ڕووناک کردۆتەوه:

**حۆریی باغی جینانی یا گوڵی باخچەی ئیرەم**
**ام نجوم العرش ام شمس علی فوق العلم**

شاعیر دەڵێت ئەی دۆست و یاران هەرگیز داوای ئەوەم لێ مەکەن کە لەگەڵ یاردا ڕابوێرم، چونکە هەر کاتێک کە ئەگەم بە یار، ئەوا شێت و بێهۆش دەبم، هەروەکو چۆن بای (صرصر) دێت هەموو خەڵک بەو بایە بێزار و هەراسان دەبن، تاکو وایان لێدێت هەموویان دەمرن بە هۆی ئەم بایەوە، خوای گەورە کاتێک قارو غەزەبی خۆی گرت لە هۆزی ثمود، ئەو بایەی نارد کە حەوت شەو و هەشت ڕۆژی خایاند، (واما عاد فاهلکوا بریح صرصر عاتیة سخرها علیهم سبع لیال وثمانیة ایام حسوما فتری القوم فیها صرعی کانهم اعجاز نخل خاویة) (الحاقه ٧:)

**قەت مەڵێن یاران لەگەڵ فیرقەت وەرە سازش بکە**
**شێت ئەبووم وەک من خۆم تووشی بای صەرصەربکەم**

حەزرەتی عیسا سڵاوی خوای لێ بێت، موعجیزەی ئەوە بوو، مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خوا (وابرئ الأکمه والأبرص واحی الموتی باذن الله). شاعیر دەڵێت، بەڵکو ئەمە خوایە گەر بۆ جارێک بەلای گۆڕەکەمدا تێپەڕ ببێت، هەروەکو عیسا فەرمان بکا هەموو هێسکە ڕزیوەکانم کۆ بکاتەوە و پاش فەوتانم زیندووم بکاتەوە:

**گەر عیسا لە پاش مردن بەسەرما، ڕابرێ**
**تجمع العظم الرسیم تحمینی بعد العدم**

مەنصوری حەلاج لەسەردەمی عەباسییەکان دەیگوت (انا الحق) کە ئەمەش بە ×اهیری شەرع کفرە، بۆیە دادگایان بۆ دامەزراند، پاشان فەرمانی دادگا دەرچوو بە کوشتنی، دەڵێن کە خوێنی ڕژا بە خوێنەکەی (انا الحق) دەنووسرا، کوردییش دەڵێت، کاتی مردنم لاشەکەم بووە تۆز و گەرد، هەروەکو مەنصور حەلاج ناوی تۆی پێ دەنووسێ، چونکە مەنز×وری حەلاج کاتێک کوشتیان، انا الحق-ی دەنووسی، کە عەشقی ئەو وتەیە بوو بە زیندوویی، منیش عەشقی تۆم پاش مردن بە سروشکم ناوی تۆ دەنووسم:

**سروشکم نەخشی ناوی تۆ دەکێشێ**
**جیگای سێدارەکەی مەنصورە ئەمشەو**

شاری کەربەلا لە ساڵی ٤١ی کۆچی، کارەساتێکی گەورەی لێ ڕوودا، کە ئەویش کوشتاری بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) بوو لە سەدەی یەزید کوری معاویە، شاعیریش ئەوها کوشتەی دەستی دڵدارەکەیەتی، هەروەکو چۆن کەو پێیەکانی سوورە، تۆش بە خوێنی من، ئاوها پەنجەکانی خۆت سوور کردووە:

**چونکە ئەمرۆ من شەهیدی کەربەلایی عیشقی تۆم**
**هەروەکو کەو پەنجەکانت وا بە خوێنم ڕشتووە**

سامیری لە سەردەمی حەزرەتی موسادا ژیاوە، کابرایەکی ساحیر و جادوگەر بووە. بە هۆی سیحرەکانی خەڵکێکی زۆری لە خشتە بردووە، جا بۆ ئەوەی عاشق فریو بدرێ، سەرنجی دڵ و دەرونی عاشقان بۆ خۆی ڕابکێشێ، ئەو دلبەرە ئەوەندە مەکر بازە، ڕەنگە کەسانی وەکو سامیری ببنە شاگردانی، واتە ئەو وەستایە و سامیریش شاگرد، خوای گەورەش دەربارەی سامیری دەفەرموێت: (قال فانا قد فتنا قومک من بعدک وأضلهم السامری) (گە ٨٥)

**بۆ فریوی عاشقان و جەزبی دڵ وا ماهیری**
**ڕەنگە شاگردیت بکا میهتەر نەسیمی سامری**

هاروت و ماروت لە قورئاندا باسیان کراوە (السحر وما انزل علی الملکین ببابل هاروت وماروت وما یعلمان من احد حتی یقولا انما نحن فتنة) (البقره ١٠٣) مامۆستا عەبدولکەریمی مودەرس دەفەرموێت (ملکین) بەفەتحەی لام واتە دوو مەلائکە، بەڵام بە کەسرەی لام واتە دوو پاشا، بەڵام ئەو دوو پاشایە پیاوی چاک بوون، بە مەلائکە ناویان براوە، بەڵام خوێندنەوەی یەکەم واتە (الملکین) دوو مەلائکە ڕاستترە، ئەو دوو مەلائکە نێردراوی خوا بوون، دوایی خەڵکیان لە خشتە بردووە و فێری سیحریان کردوون، خوای گەورەش غەزەبی لێگرتوون، سەرپشکی کردوون لە نێوان سزای دنیا، یاخود قیامەت، ئەوانیش سزای دنیایان هەڵبژاردووە گوایە سەراوژێر لەناو بیردا هەڵواسراون، بەڵام موفەسیرەکان ئەم قسەیە ڕەت دەکەنەوە، چونکە خوای گەورە دەربارەی مەلائکە دەفەرموێت (لایعصون الله ما امرهم و یفعلون مایومرون) تەفسیری نامی بەرگی یەکەم. شاعیر ئەم بەسەرهاتەی بەم شێوەیە سوود لێ وەرگرتووە کە چاڵی سەرچەناگەی خەڵکێکی زۆری تێدا ئەسیر کراوە، هەروەکو چۆن هاروت و ماروت لە چاڵدا هەڵواسراون:

**چاهی ژێری لێوت وا ئەسیرن**
**هەزارانی وەکو هارووت و مارووت**



# شیعرێك لە نێوان (نالی) و (کوردی) دا



**محەمەد حەمە باقی**

### سەرنج:

-١-

ئەم وتارە لە بنەڕەتدا، ساڵی (١٩٨٠)، واتە (٣٣) ساڵ بەر لە ئێستا نووسراوە و لە ژمارە (٤)ی گۆڤاری (نووسەری کوردستان-ی یەکێتی نووسەرانی کوردستان)، لە (ناوزەنگ) چاپ و بڵاوبۆتەوە و دواتر لەگەڵ چەپکێ وتاری تری ئەدەبیدا، لە کتێبێکمدا (ڕاوە گزنگ)[١] چاپ و بڵاوبۆتەوە، بەڵام دواتر، دوای چاپ و بڵاوبوونەوەی دیوانی (مستەفابەگی کوردی)، لەلایەن (محەمەد مستەفا: حەمەبۆر)[٢] ەوە-ئەم وتارە، پێداچوونەوە و ئاڵوگۆڕی تری بەسەردا هاتووە و دیسانیش بۆ ئەم داوایەی (ڕۆڤار)، چاوگێڕانەوەی تری وەک ئەم شێوەیەی ئێستای بەرچاوتانی لێهاتووە.

-٢-

مستەفا بەگی کوردی و سالم و نالی، کە بە شاعیرانی سێ کوچکەی میرنشینی بابان ناسراون و لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا، لە بەخشین و درەوشانەوەدا بوون و بەهۆی نزیکایەتی و خزمایەتییان لە میرانی بابان و کاربەدەستانی باڵای ئەو میرنشینە و گیانی نیشتمانپەروەرانەیان، سەرومڕ تێکەڵاوی ڕووداوەکانی ئەو قۆناغەی میرنشینی بابان بوون و بەو هۆیەشەوە کە میرنشینی ناوبراو، لەو قۆناغەدا زۆرترین و تاڵترین ڕووداوی کارەساتباری شـەڕی دەوڵـەتـی عوسمانی و قاجاری و والیەکانی بەغداد و مووسڵ و شەڕی خۆبەخۆیان و یەکتر کوشتن و ڕاوەدوونان و دەربەدەریی بوون، هەر بەو جۆرە ئەم سێ شاعیرەش، بەخواستی خۆیان بووبێ، یان لابەلاو بەناچاریی، لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەوە گلاون و ئاوارەیی شـاران و وڵاتان و دەربەدەریی و سەرهەڵگرتنی نابەدڵییان لێ بۆتە قەدەر و چارەنووس.. هەموو ئەمانەش کاردانەوەیان لە هەست و ویژدان و لە ڕۆح و بە واتەیەکی تر: لە شیعری ئەم سێ شاعیرەدا دروستکردووە و هەرسێکیان شیعری ئاوارەیی و غەریبایەتی و سەرهەڵگرتنیان هەیە.. بەو هۆیەشەوە کە ئەم شیعرانەیان لە هەلومەرجی یەک ڕۆژگـار و یەک کەش و هەوای هاوبەشدا نووسیبێ، دەشێ کەش و هەوای شیعرەکانیشیان بە یەکدی نزیک بێت.

بۆیە لە هەندێ لەو جۆرە شیعرانەی ئەم سێ شاعیرەدا، ئەگەر پێش چاپ و ئاشنایەتیمان لەگەڵ ئەو شیعرانەدا، ناوی شاعیرەکانیان لەسەر نەبوونایە، ڕەنگ بوو زۆر بە دژواری شیعرەکانیان لە یەکدی جیابکرایەتەوە.

بەڵام دوای بەچاپ گەیاندنی دیوانی ئەم شاعیرانە (سـەرەڕای سەرنج و تێبینی زۆریش لەسەر چۆنێتی ساغکردنەوەی ئەو دیوانانە)، ئاشنایەتیمان لەگەڵ جـۆری فـەرهـەنـگ واژە و تــەلاری ڕسـتـەسـازی و پاشخانی ڕووناکبیری و زمانپاراویی هەر شاعیرێکیان ودڵبەستەبوونمان بەئاست و ئەندازەی جیاجیا، بە شیعری هەر یەکێکیانەوە، ئەوسا شێوازی هەریەکەیانمان دێتە دەست و کەم و زۆر پێناسەیان جیا دەکەینەوە.

ئەم سێ شاعیرە، سەرباری هاوبەشبوونیشیان لە زۆر لایەنەوە، بەڵام دیسانیش دەتوانین بڵێین ئەوەندەی نزیکایەتی و هاوبەشبوونی زۆر لایـەنـی شیعریی نێوان (نالی) و (کـوردی)، بە تایبەتیش فەرهەنگی واژە و وێنەی شیعرییان هەست پێدەکرێ، ئەوەندە هاوبەشبوونی (سالم)، لەگەڵ (نالی) و (کـوردی) دا، هەست پێناکرێ. بـەواتـا: ئـەوەنـدەی شێواز و سنعەتسازیی شیعر و فەرهەنگی واژە و وێنەی شیعری (سالم)، لەچاو شێواز و سەبکی (نالی) و (کوردی) دا جیاوازە و بە زەقیی دیارە و شیعری (سالم) لەگەڵ شیعری (نالی) و (کوردی)دا، ئاسانتر جیادەکرێتەوە، ئەوەندە بە ئاسانی و خێرا، شیعری (نالی) و (کوردی) لەیەک جیاناکرێنەوە، وەک نموونەی ئەم شیعرەی لەم لاپەڕانەدا لێی دەدوێین.

***

ئەم شیعرە، لە دیوانی (کوردی)، چاپی (گیوموکریانی) دا (٣) (١٣) بەیتە و بە شیعری (کوردی) داناوە و بەمجۆرەیە:

**عەزیزان! من ئەوا ڕۆیم لەلاتان**
**لە مەظلومان بەڵا چۆڵ بێ وڵاتان**
**کە ئێوەن پادشای لوتف وعەدالەت**
**بەخوا حەیفە بڕەنجێنن گەداتان**
**٣-ئەگەرچی خاک وخۆڵی ڕەهگوزارم**
**بەسەرما خۆ گوزەر ناکا سەباتان**
**٤- وەرە بنوارە چاوی پڕ لە خوێنم**
**بەتەفصیلات ببینن ماجەراتان**
**٥- کە من ڕۆیم جەهەنم پڕمەکەن لێم**
**لەمن خاڵی مەکەن کۆشک وسەراتان**
**٦- جەفاتان دام و کوشتمتان بە زاریی**
**نزولی ڕەحمەتە جەور و جەفاتان**
**٧- ئیلاهی من ببم ڕۆژی دوسەد جار**
**بەقوربانی گەدا و پادشاتان**
**٨- مەڵێن کەڵکی نەبوو، ڕۆیی جەهەننەم**
**سەرم قەڵخانە بۆ تیری قەظاتان**
**٩- نەسیمی کۆیی تۆ،خاتر دەکا جەم**
**بەبۆی گوڕەی پەشێوەی پانیاتان**
**١٠- منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم**
**دەترسم من بڕۆم، بشکێ سوپاتان**
**١١- ئەگەر سەربوو، ئەگەر دڵ بوو، ئەگەر ڕۆح**
**هەموو ڕۆیین، چییە ئیتر تەماتان!**
**١٢- سەفەرمان چونکە ڕێ هات و نەهاتە**
**دوعامان بۆ بکەن ئێوە و خوداتان**
**١٣- تکای (کوردی) وەهایە، ئێوە جارجار**
**بکەن یادی موحیبی بێ ڕیاتان**

***

هـەر ئـەم شیعرە، لـە دیـوانـی (نـالـی) (٤)، چاپی



مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی: فاتح و محەمەدا، (٧)بەیتە و بە پاڵ (نالی) دراوە و بەمجۆرەیە:

**ڕەفیقان! من ئەوا ڕۆییم لەلاتان**
**لە مەظلوومان بڵا چۆڵ بێ وڵاتان**
**٢- بڵا سا شاربەشار و دێ بە دێ بین**
**لە دەست یاران بکەین تەیی وڵاتان**
**٣- مەڵێن کەڵکی نەبوو، ڕۆیی، جەهەننەم**
**سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان**
**٤- سەفەرمان چونکە ڕێی هات و نەهاتە**
**دوعامان بۆ بکەن، ئێوە و خوداتان**
**٥- منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم**
**دەترسم من بڕۆم، بشکێ سوپاتان**
**٦- شکاری وەحشییان بەس دەستەمۆکەن**
**نەوەک بەربێ شکاری خانەزاتان**
**٧- ئەوەند ئەرجو دەکا(نالی)، کە جارجار**
**بکەن یادی موحیببی بێ ڕیاتان**

***

ئەم شیعرە، تاچاپکردنی لە دیوانی ناوبراوی (نالی) دا، لای زۆربەی شیعردۆستانی شیعری کلاسیکی ئەم ڕۆژگارە، بە شیعری (مستەفابەگی کوردی) دەزانرا. دکتۆر(مارف خەزنەدار)یش، لە دیوانی (نالی وفەرهەنگی نالی)یەکەیدا[٥]، خۆی لەم شیعرە بواردووە و کەم و زۆر، بۆرە ئاماژەیەکیشی بۆ نەکردووە. بەڵام مامۆستایان: مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی، لەبەر ڕۆشنایی ئەوکۆمەڵە تێکست و دەستنووسانەی لایان بوو، ڕوونکردنەوەیەکیان لە پاڵدا نووسیوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی:
ئەم پارچە شیعرە، لە زۆربەی دەستنووسەکانی بەردەستماندا دراوەتە پاڵ نالی. . جیاوازیی ئەم (٧) بەیتە و(١٣)بەیتەکەی ناو دیوانی(کوردی-گیوموکریانی)، هەندێ ئاڵوگۆڕی زنجیرە و ژمارەی بەیتەکانە.. بێجگە لەوەش کە بەیتی یەکەمی هەردوو پارچەکە، لە دیوانی (کوردی)دا (عەزیزان) و لای ئێمە (ڕەفیقان)ە. بەیتی یەکەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و حەوتەمی ئەم (٧)بەیتە، لەو شیعرە (١٣) بەیتییەدا هەیە، کە بە ناوی(کوردی)یەوە، لە دیوانی (کوردی)دا چاپکراوە[٦].

ئەمەش هەڵبەستەکەی (کوردی)یە:
**١- ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لەلاتان**
**لە مەظلومان، بلا چۆڵ بێ (ویلا)تان**
**٢- کە ئێوەن پادشای لوتف و عەدالەت**
**گەلێ حەیفە بڕەنجێنن گەداتان**
**٣- لەسەر حەق بن نیگەهدارتان خودایە**
**موبارەک بێ هەزار دەفعە سەراتان**
**٤- وەرن بنوارنە چاوی پڕ لە خوێنم**
**بە تەفصیلات ببینن ماجەراتان**
**٥- لە بێگانە گەلێ خۆ چاترێکە**
**چ دادێکتان دەدا چقەی کولاتان**
**٦- لە دوای قەبری ئەلی گێژ و گوڵنگە**
**بە مەرگی ئێوە سا نادا دەواتان**
**٧- مەگەر خۆتان بە گورجێ بێنەوە دەست**
**ئەگەر نا تازە چوو حوکمی ڕەواتان**
**٨- نەسیمی کۆیتان خاطر دەکا سەرد**
**بە بۆنەی صوورەی پەشێوی ناتەباتان**
**٩- بەچی وا خورڕەمن، ئاخر لە بۆ کێ؟؟**
**نیکاحی باطیلە ساز و سەواتان**
**١٠- منیش بۆ ئاخرە داد و فیغانم**
**مەکەن ئیخلافی ئەو وەعدەی کە داتان**
**١١- ئەگەرچی خاک و خۆڵی ڕەهگوزارم**
**بەسەرما خۆ گوزەر ناکا صەباتان**
**١٢- هەتا من بێ هەواتر بووم، بە صەد ڕەنگ**
**لە دەرحەق من زیاتر بوو هەواتان**
**١٣- هەتا دوێنێ لە مەجلیس تاقە گوڵ بووم**
**ئەوا (بووم)ە، لە جێی شێخ و مەلاتان**
**١٤- کە من ڕۆیم جەهەننەم پڕ مەکەن لێم**
**لە من خاڵی مەکەن کۆشک و سەراتان**
**١٥- موحەققەقمە، کە (هیجری)ی غوربەتیشم**
**ڕەهام ناکا، لە (تیر)ی لابەلاتان(٧)**

پێشەکی دەبێ ئەوەمان لەیاد بێت، کە ئێمەی کورد، لەبەر ئەوەی ئەرشیفی ئەدەبیی نووسراومان لەو چەند دەستنووسە کۆن و تێکستە کەمە تێپەڕ ناکات، کە بە ڕێنووسی عەرەبی و خەتی فارسی، لە هەندێ کون و قوژبن و باوڵدا بۆمان ماوەتەوە و تا ئێستاش ئەم ئەرشیفە هەژار و پەرپووتەمان چۆن هاتبێتە بەردەست، هەروا بەبێ توێژینەوە و بژارکردن، یەکسەر وەرمان گرتووە و تێکستەکەی چۆن بووبێت، لای ئێمەش هەروا بێ سێ و دوو، ڕۆیشتووە.

بەڕای من، ئەمە کارێکی پێچەوانەی ڕێبازی زانست و ساغکردنەوەی زانستییانەیە، بۆ وێنە: تائێستا ئەو دیوانگەلە شیعرانەی لەلایەن مامۆستا (گیو موکریانی) یەوە چاپکراون، زۆربەی شیعری شاعیرەکان، تێکەڵ و پێکەڵ کراون، شیعری ئەم دراوەتە پاڵ ئەو، ئەو دراوتە پاڵ ئەم، هەر بەم جۆرەش هەندێ نووسیاری لەمەوبەرمان، وەک ئەم مامۆستایەیان کردووە و دەستنووس و تێکستە جێماوەکانی ئەوانیش، شتێکە لەم بابەتە و پێویستە لەسەر هەر دەستنووسێک، چەندان جار چاوی بژار و جیاکردنەوەیان پێدا بگێڕدرێتەوە، بۆ ئەوەی شیعری شاعیرێک، بە زۆرەملێ و بەبێ بەڵگە و سەلماندن، بەسەر شاعیرێکی تردا نەسەپێت، یان جیاکردنەوەی شیعری جوان، جوان و هەڵبژاردەی شاعیرێکی تر و لکاندنی بە شاعیرێکی ترەوە (لەبەر هەر مەبەستێک بێت)، ڕوونەدات.

بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش پێویستە ئەوە بزانین کە هەموو شاعیرێک، لە سنوورێکی دیاریکراودا، کۆمەڵێک واژە و وێنە و شێوەی داڕشتن و سنعەتسازیی خۆی هەیە، ئەو فەرهەنگەی شاعیرێک بەکاری دێنێ، لە زۆر ڕووەوە زۆر جیاوازترە لە فەرهەنگی واژەی شاعیرێکی تر، ئەو تەکنیک و کەسایەتی و تایبەتمەندییەی شاعیرێک هەیەتی، گەلێ جیاوازترە لە جێ پەنجە و سنعەتسازیی و تایبەمەندی شاعیرێکی تر، کە ئەنجام وا هەست پێدەکرێت شاعیرەکە دنیایەکی تایبەتی و بۆن و بەرامەیەکی سەربەخۆی دەبێ، یان بە واتایەکی تر، وەک مامۆستا (مەسعود محەمەد) دەڵێت: (ناسینەوەی شیعری شاعیر، بۆ زەوقی شیعردۆست، تاڕادەیەک وەک ناسینەوەی دەنگی گۆرانیبێژە)، ئەمە لە کاتێکدا کە شاعیرەکە دەنگی تایبەتی و شێوازی تایبەتی خۆی هەبێت، بە تایبەتی بۆ یەکێکی وەکو (نالی)، کە ئێمە لە ڕووی ئەم شیعرەوە مەبەستمانە.

سەبارەت بەم شیعرەش، پێش ئەوەی ئەم چەند بەیتەش بە ناوی نالی-یەوە چاپ بکرێت، دەمێکە پێم وایە سەرتاپای ئەم شیعرە هی نالی-یە، چونکە ئەوەی نالی دۆست بێت، دەزانێت سنعەتسازیی وجێپەنجەی هونەری شیعری (نالی)، بە زەقی بەم شیعرەوە دیارە. واتە: بۆن و بەرامە و کەش و هەوای (نالی) هاوار دەکات. تەکنیکی شیعر، لای (نالی)، وەک تەکنیکی زۆر شتی سروشتیی وایە، چونکە ژانی لەدایکبوونی شیعر لای (نالی)، ئەوەندە سروشتیی و بێن درێژە، کە هاتوونەتە دنیاوە و چاویان هەڵهێناوە، هیچ سیما و نیشانەیەکی لەباربردن و زۆر لەخۆکردنیان پێوە نابینرێت، بەجۆرێک وەک (کیتس) دەڵێت: وەک چرۆکردنی گەڵای درەخت وان، چۆن لە وەرزی چرۆکردندان، بەکاوەخۆ چرۆ دەکەن، سەرەدەرەدەهێنن.. شیعریش لای (نالی)، ئاوا لە وەرزی خۆیاندا، دوای دەم کێشان، دوای پیشان، دوای بژار و ئارایشتێکی هەناسە درێژ و سەلیقەیەکی بەرز، لەدایکبوون..

زۆرجار کە لە شیعرێکی (نالی) ورد دەبمەوە، وا هەست دەکەم شیعرەکە هەر لە بنەڕەتدا خۆڕسکە و لق و پۆپ دەرکردنی کێشابێت، یان چۆن شێوەی هەڵکەوتن و دروستبوونی چیای (پیرەمەگروون) و (هەندرێن)، هەر لە سروشتدا وان و ئەگەر دەستکاری بکرێن، یان ئاڵوگۆڕ بەجێگاکانیان بکرێت، یەکسەر پێیانەوە دیارە، شیعری نالی-یشم وا دێتە بەرچاو، کە ئەگەر دەستکاری هەندێ واژە و جێگاگۆڕکێیان پێبکرێت، بنچینە و سروشتی بەیتەکە، وەک ئەو شوێنانەی لێدێت، کە بوومەلەرزە کاولیان دەکات، یان وەک (ئەدۆنیس) واتەنی: وەک ئەو پایانەیان لێدێت کە ئەگەر خشتێکیان لێ دەربهێنرێت، سەرتاپای پایەکە دەڕووخێت، بە پێچەوانەی شیعری ترەوە کە گەلێک جار، ئاڵوگۆڕکردنی واژەیەک، یان لێدەرهێنانی واژەیەکیان، هیچ لە تەکنیک و مۆسیقا و واتای شیعرەکە ناگۆڕێت، ئەوەی شارەزای شیعری نالی بێت، دەزانێت شیعری (نالی) گەنجینەیەکە، هەر بەیتێکی، هەر واژەیەک چەندان وردەکاری و مەودای مانا و مەجازی و وێنەی ئاخنراوی تێدایە، ڕێدەکەوێت لە تاکە بەیتێکی (نالی) دا، چەندان وێنەی جیاو تێکەڵی تێدا بێت، بە جۆرێک دەبێتە جێی ڕامان و حەپەسان، کە چۆن ئەم شاعیرە، ئەم هەموو وردەکاری و سنعەتسازیی وێنە زۆرەی لە تەنیا بەیتێکدا کۆکردۆتەوە، ئەوەندە شیعری (نالی) لای خوێنەر، جێی وردبوونەوە و لەنگەرگرتنە، شیعری هیچ شاعیرێکی ترمان وانییە، بۆیە بەناو دنیای شیعری (نالی) دا تێپەڕ دەبم، دەڵێی بە سواری ئۆتۆمبیلێکی خێرا، بەناو شارێکی زۆر جوان دا تێپەڕ دەبم، ئا لەو شارە جوانەی (نالی)دا، هەموو شتەکانی جیاواز و تایبەتن، هیچ شتێکی ئەم شارە، لە هیچ شتێکی شارێکی تر ناچێت.. دەشێ شارەکانی تر چاویان لەم کردبێت و جێ پەنجە و نیشانەی ئەمیان پێوە دیار بێت، بەڵام شارەکەی ئەم: (نالی)، ڕەنگڕێژ و دەستکرد و پەرداخەی خۆیەتی.. کەواتە وەک چۆن ئەوەی ڕووباری (سیروان) و چیای (پیرەمەگرون)ی دیبێت، ئیتر شێوەیانی لێ ون نابێت و لە نزیک و دوورەوە دەیانناسێتەوە، ئاوا شیعری (نالی)یش ئەم سروشتە



خۆڕسکەی هەیە، هەر لە دوورەوە دەناسرێتەوە.
با ئێستا لەگەڵ تەواوی شیعرەکەدا بژین، بۆ ئەوەی بزانین دەتوانین هەندێ جیاوازی و بەراوردکاری، لای (نالی) و (کوردی) دەستنیشان بکەین!.
وشەی (بڵا-بلا) کە لە بەیتی یەکەمی ئەم شیعرەدا هاتووە و بە مانای (لێی گەڕێ، قەیناکە، باوابێ)یە و (نالی) و (کوردی)یش بەو هۆیە کە لە ڕووی فەرهەنگی واژەوە لە یەکدی نزیکن، هەردووکیان بەکاریان بردووە[٨]، بەڵام لای (نالی) زۆرتر بەکاربراوە، وەک ئەم نموونانەی لەم چەند بەیتەدا هەن:

**١- چونکە نەتکرد قوڕ بەسەریا، تاوەکو تەسکین ببێ.**
**مەیدەرە بەر پێ لەقە، توخوا (بڵا) بگری بەتاو**
(دیوان- ل٣٦٦)

**٢- (بڵا) بۆ کوندەبوو بێ، مفتی مشک و ماری کەندوو بێ**
**خەطیرەی گەنجی وێرانە، زەخیرەی کونجی کاشانە**
(دیوان- ل٤٨٣)

**٣- گەهێ ئاهو ڕەوش شاهی، گەهێ گەوهەر مەنیش ماهی**
**(بڵا) با سینە سەحرابێ، (بڵا) با دیدە دەریا بێ**
(دیوان- ل٦٠٢)

**٤- ئەگەر تەکیە، ئەگەر شێخە، هەموو داوی عەلایق بوون**
**(بڵا) نالی بچێ مەستی خەرابات و موجەڕەد بێ**
(دیوان- ل٦٣٢)

یان وشەی (بنواڕە)، کە لەم بەیتەدا هەیە:
**وەرە (بنواڕە) چاوی پڕ لە خوێنم**
**بە تەفصیلات ببینن ماجەراتان**
کە ئەم واژەی (بنواڕە)یەی، لەم چەند بەیتەدا بەمجۆرە دووبارە کردۆتەوە:

**١- وا ظەن مەبە ڕوخسارەیی تۆ، غائیبە قوربان**
**(بنواڕە) چلۆن نەقشە، لەنێو دیدەیی تەڕما**
(دیوان- ل١٢١)

**٢- (بنواڕە) بوونی ئەووەڵت و چوونی ئاخرت**
**هاتی چ ڕووت و قووت، هەڵاتی چ لووس و پووس؟**
(دیوان- ل٢٣٩)

**٣- گەر ئاب و تابی جەننەتی بۆ دۆخیت دەوێ**
**(بنواڕە) نێوچەوانی بەشووش و برۆی عەبووس**
(دیوان — ل ٢٤٠)

**٤- وەرە (بنواڕە) دوو دەستی حەنایيم**
**حەنایی چی؟ هەموو هەر خوێنە قوربان**
(دیوان- ل٣١٥)

**٥- ئەی شەمسی مایەپەروەر و ئیکسیری خاک**
**(بنواڕە) حاڵی هالیکی ئەم خاکە ئەحقەرە**
(دیوان- ل٤٣١)

**٦- (بنواڕە) وشکەسۆفی و ڕەقسی بە هەڵهەڵە**
**دیسان لە بەحری وشکی هەوا، کەوتە پێ مەلە**
(دیوان- ل٤٦٧)

**٧- (بنواڕە): سروشکی من، کە لێڵاوە، غوباری کوهـ و هاموونە**
**وەرە سەرچاوەکەم (بنواڕە)، وەک ئاوێنە، چەند ڕوونە**
(دیوان- ل٥٣٠)

**٨- (بنواڕە) نەوبەهار و فتوحاتی گوڵشەنی**
**گوڵ زاری کـــردەوە، لـــەدەمـــی، خـــونـچـە پێکەنـی**
(دیوان- ل٦٢٢)

**٩- (بنواڕە) خوشیی ڕەقسی لەگەڵ خەرقەیی ئەزرەق**
**مومکین نییە بەم پاکییە، لەم ئەرزە، سەمابێ**
هەروها واژەی (تورە)، کە لەم بەیتەدا هەیە:
**نەسیمی کۆی تۆ، خاتر دەکا جەم**
**بە بۆی تورەی پەشێوی پانیاتان**
(نالی) لەم چەند جێگایەی تردا، ئەم واژەیە بەمجۆرە بەکار دەهێنێ:

**١- تاتایی سەری (تورەیی) پڕ پێچشی بادا**
**هەر تایەکی بارێکی گوڵ و ئافە بەبادا**
(دیوان- ل٨٣)

**٢- (تورەت) وەکو تۆماری شکستە و سەری کوڵمت**
**بۆ نووری سەوادم بووەتە شەمعی موتاڵا**
(دیوان- ل١١٦)

**٣- شایستەی شان، لایقی، مل (گورەیی) تۆیە**
**نەک (تورەیی) شاهەنشەهی و تەوقی وەزارەت**
(دیوان- ل١٤٥)

**٤- بۆ مەشقی عەشقی زوڵفی نیگارو نیگارشی**
**نالی لە خامەدا بووەتە شاهی (تورەنووس)**
(دیوان- ل٢٤٠)

**٥- وەک (تورەیی) پێچیدەیی تۆ، ساغ و شکستەم**
**وەک نەرگسی نادیدەیی تۆ، خۆش و نەخۆشم**
(دیوان- ل٢٨١)

**٦- سەوادی ئەو، ئیشتیهای سەهوی جوان**
**بەیازی (تورەیی) ئەم ئینتیباهی سوجدەی پیر**
(دیوان- ل٢٠٦)

**٧- لە شەوقی ڕووی شەمع و زوڵفی دوودو (تورەیی) مەحجەر**
**سوپەندو عوودو پەروانە، بخوورو غالیبە سووتن**
(دیوان- ل٣٢٩)

**٨- بە (تورە) وەک پەڕی تاوس، بەگەردەن ئاهووە، یەعنی**
**لەسەر ئاهوویی گەردەن، هەردوو حەڵقەی داوە زوڵفەینی** (دیوان-ل٦٧٧)

**٩- ڕەیاحین پەرچەم و لالە کولاه و یاسەمین (تورە)**
**بەنەخشە خاڵ و، نەرگس چاوو گوڵ زارو سەمەن ساقە**
(دیوان-ل٤٥٥)

**١٠- لە دنیا جەننەتی باقی تەلاری شاهییە، ساقی**
**حەبیبە (تورەیی) تەوقی ملی (شیرین) و (عەزرا)یە**
(دیوان- ل٥٦٩)

دیسان واژەی (دەستەمۆ)، کە لەم بەیتەدا هەیە:

**شکاری وەحشییان بەس (دەستەمۆ) کەن**
**نەوەک بەربێ شکاری خانەزاتان**

لەم بەیتەشدا دووبارەی کردۆتەوە:

**لێم حەرامە دانە و ئاوی حەماماتی حەرەم**
**من کە بازی دیدە بازم، نەک شەوارەی (دەستەمۆ)م**
(دیوان-ل ٣٠١)

یان کە لە بەیتی دواییدا دەڵێ:

**ئەوەند ئەرجوو دەکا (نالی) کە جارجار**
**بکەن یادی موحیبی بێ ڕیاتان**

واژەی (ڕیا)، کە (نالی) سەرکەش و سەربڵندە، زۆر ڕقی لێی بووە، لە گەلێک جێگەی تری دیوانەکەیدا بە قێز و بێزەوە بەکاری دەهێنێ، ئەمە نیشانە گەورەکەی (نالی)یە، کە هەمیشە سەربەرز و نەفس بەرز بووە و هەرگیز چاوشۆڕی کەس نەبووە، کە (ڕیایی) لەبەردەمدا بکات، بۆیە لە چەند شیعرێکی تریدا واژەی (ڕیا) بەم شێوانە بەکار دەهێنێ:

**١- خاتری زاهیدی خاڵی، خاڵی**
**نییە ئەڵبەتە لە بێنێکی (ڕیا)**
(دیوان-ل١٢١)

**٢- ڕیشەکەی پان و درێژە، بۆ (ڕیا) خزمەت دەکا**
**زاهیرە هەر کەس بە گوول و عەرچی ڕیشیدا (ڕیا)**
(دیوان-ل١٢٨)

**٣- خۆشترە عوزری گونەهکاران لەسەد زیکری (ڕیا)**
**ئەم بە نەرمی عەفوە عەفوە، ئەو بە توندی عەف عەفە** (دیوان-ل٤٥٢)

**٤- سۆفی (ڕیا)یە خەڵوەتی، بێنی بەهاری کرد**
**هاتە دەرێ لە سایەی چایەر، حەسایەوە**
(دیوان-ل٥٥٤)

**٥- نالی کە ویقاری نییە، بێباکە لەخەڵقی**
**سۆفی کە سلوکێکی هەیە، عوجب و (ڕیا)یە**
(دیوان-ل٥٦٥)

**٦- بە (ڕیا) باری تەکالیفی ڕسوومی بۆ خەڵق**
**چ دەکێشێ؟ ئەمە حومقێکە، عەلاوەی کەرییە**
(دیوان-ل٥٨٦)

بەڵام واژەی (ڕیا)، هەر لەم تاکە بەیتەی (کوردی) دا هەیە:

**مەکەن مەنعم لە ئاهوو ناڵە، (کوردی)**
**سەبووری خۆی (ڕیا)کارانە، ئەمشەو**

یان (نالی) کە دەڵێ:

**منم سەرکردەتان بۆ لەشکری خەم**
**دەترسم من بڕۆم، بشکێ سوپاتان**

ئەم واژە لێکدراوانەی وەک (لەشکری خەم)، کە بەدوو واژە، ئەم وێنە سەیرە دروست دەکات، شتێکە هەر ئیشی (نالی)یە... ئەم ئیشانەی (نالی)، من وام دێتە بەرچاو، کە دوو تەلی کارەبا: سارد و گەرم، لێکدەدات و ئەنجام کڵپەیەک، بروسکەیەک، ئاگرێک ڕووناکییەک، بەدەستەوە دەدات، بەڵام لای (نالی)، ئەم لێکدانی دوو واژەیە، ئەم وێنە شیعرییانە دروست دەکات.

با بۆ وێنەی تری لەم بابەتەی (نالی)، چەند شیعرێکی تری بگرین، کە هەمان سنعەتسازییان تێدایە:

**١- تیرەکەی ئەو ڕۆژە، مەحبووبەم کە لوتفی کرد بەمن**
**گەر نەبەخشێ مەرهەمی وەسڵی، برینم کارییە**
(دیوان-ل٥٨٣)

دەشێ لە هەموو دەرمانخانەیەکدا جۆرەها مەرهەم چنگ بکەوێت، بەڵام لە هیچ دەرمانخانەیەکدا (مەرهەمی وەسڵ)نییە، کەچی لە حەقیقەتیشدا (مەرهەمی وەسڵ)هەیە، (مەرهەمی وەسڵ)، لای عاشق، ئەو دیدەنی و سەردانە پیرۆزەیە، کە دڵدار سەر لە دڵدارە پێکراوەکەی خۆی دەدات، دیارە دڵدارە پێکراوەکە، زامەکان سارێژ دەکات.

**قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکت**
**شەرابم عەینی ژەهری مارە بێ تۆ**
(دیوان-ل٣٨٢)

لێرەشدا (شەربەتی دیدار)، جۆرێکە لە وێنەیەکی پێشووتر، دیداری دڵدار ئەوەندە شیرینە، هەموو شەربەتێکی تر لە ئاستیدا تاڵە، بۆیە ئەگەر وەک شتی (ماددی)، شەربەتی-دیدار، لای دڵدار نەبێت، ئەوا شەربەتی دیدار، ئەو ڕوخسارە خاوێنەی دڵدارە، کە شەربەت و هەنگوین و شەکرێکی ڕۆحیی دەڕژێنێتە گیانەوە.. ئەو گیانەی، ژیان پڕی کردووە لە تاڵاو.. لە کاتی دیدەنیدا پڕ دەبێ لە شیرینی.

یان:



**دەورانییە، وەک هێڵەکی سەودا، سەری گێژم**
**بۆیە بە دەقیقی مەثەلە، هەرچی دەبێژم**
(دیوان- ل٢٧٦)

ئێمە هەموومان بەو شتە دەڵێین (هێڵەک)، کە (کەمە)یەکی جوغزداری هەیە و ژێرەکەی بە تۆڕی کون ورد، یان ژێی ورد و چنراو، دروستکراوە، کەچی لێرەدا (هێڵەک)، سەری (نالی) خۆیەتی! بەڵام کەللە سەرێکی ئاسایی نا، کەللە سەرێکی پڕ جۆش و خرۆش و ئاهەنگی سوتانی عەشقێکی گەورە.. ئەو هێڵەکەی سەری (نالی)، هێڵەکێکی سەودایە.. ئینجا ورد ببنەوە، هێڵەک خۆی لە کاتی بەکارهێنانی و کارپێکردندا، دەجووڵێ و دەخولێتەوە.. سەرباری ئەوەش ئەو هێڵەکە، عاشق بێت! ئەوە ئەو هێڵەکە سەودایە دەردەچێ، کە سەلیقەی (نالی) وای لێدەکات هەرچی ببێژێ، لە پەند و وتەی بە قەوارە بچووک و بە مانا گەورەی لێ پێکدێت.

یان:

**لە حەسرەت سەرووی قەدت، چاوی نالی**
**دوو جۆگە، بەڵکو دوو ڕووبارە بێ تۆ**
(دیوانل٣٨٤)

ئەم واژەی (سەروو)ە، لەگەڵ واژەی (قەد)دا، لێکدەدرێن، (سەرووی قەد)یان لێ پێکدێت، کە تێکڕا وێنەی باڵایەکی بەرز و ڕێکی دڵدارەکەی (نالی)مان دێنێتە پێش چاو.

ئەگەر بۆ وێنەی تری لەم بابەتەی (نالی) بگەڕێین، کە ئەم جووتە واژە لێکدراوانەی وەک (لەشکری خەم، مەرهەمی وەسڵ، شەربەتی دیدار، هێڵەکی سەودا، سەرووی قەد)یان لێ پێکهاتووە، وێنەی تر لە دیوانی (نالی) دا زۆرە.

بەڵام وابزانم ئەو چەند وێنەیە، تینوێتی ئەم مەبەستەمان دەشکێنێ.

هەروەها ئەم بەیتەی:

**ئەوەند ئەرجوو دەکا (نالی)، کە جارجار**
**بکەن یادی موحیبی بێ ڕیاتان**

چەند نزیکە هەر لەم بەیتەی (نالی) خۆی:

**ڕەنگی زەرد و سووری خەوف و خەجڵەتی، ئاوی حەیای**
**وا تکاو ئەرجوو دەکەن عەفووی بکات وەک عەبدی خۆی**
(دیوان- ل٦٩٢)

ئەم بەیتانە وا.. دیسان هەر بەیتێکی تری ئەم شیعرە، کە دەڵێ:

**ئەگەرچی (خاک و خۆڵ)ە، ڕەهگوزارم**
**بەسەرما خۆ گوزەر ناکا سەباتان**

یەکسەر و دەم و دەست ئەوەمان بیر دێتەوە، کە (نالی) وەک هەموو واژەسازییەکی، واتە: خۆی ئاسایی، ئەگەر لە واژەی (خاک و خۆڵ)، چەند مانایەکی مەبەست بووبێت، ئەوا (یەکێک) لەو مانایانە، ئەو گوندی (خاک و خۆڵ)ەی مەبەستە، کە خۆی تیایدا هاتۆتە دنیاوە، کە ئەمە هیچ گومانێک ناهێڵێتەوە لەوەی کە لەم بەیتەدا دەڵێت: جێ نزرگە و هەوارگە و هاتووچۆم، هەر بۆ (خاک و خۆڵ)ە، ئەو (خاک و خۆڵ)ەی کە هەمیشە لە بیرەوەری (نالی)دا زیندوو بووە و لە نزیک و دوورەوە، بە حەسرەتی دیدەنییەوە بووە، ئەوەتا لە (شام)ەوە، لەو قەسیدەیەدا، کە بۆ (سالم)ی شاعیر و هاوڕێی نووسیوە، هەر (خاک و خۆڵ) دەژی:

**داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی (خاک و خۆڵ)**
**هەتا نەکەی بە خاکی (سولەیمانی) یا عوبوور**
(دیوانی- ل١٨١)

یان لەم شیعرەی تریدا، کە دیارە هەر لە دەرەوەی کوردستان نووسیویەتی:

**تری عینه الابدان من خاك و خۆڵ)ە**
**تری مندل الاوراق من توزو گردە**
(دیوانی- ل٤٠٣)

دیسان لە بەیتی (٥)ی دیوانەکەی (نالی)دا، کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد و بریتی بوو لە:

**منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم**
**دەترسم من بڕۆم، بشکێ سوپاتان**
(دیوان- ل٣١٩)

ئەگەر سەرنج بدەین (نالی) لەم بەیتەدا، خۆی وەک سوپەر و قەڵغان و بەرگریکارێک لە ئاسوودەیی خەڵک دەچوێنێ، کە لەپێناوی بەختەوەریی خەڵکدا، خۆی کردۆتە سەرباشقە و پێشەنگی بە تەنگەوە هاتووی هەموان و خەمخۆری دەوروبەرەکەی، کە ئەو (نالی) لەجیاتی خەڵک، بۆتە (مامە خەمە)ی هەموان و بۆ ئەوەی (خەم)، یەخەی هیچ کەسێک نەگرێ، (ئەم) داوای لە (خەم) کردووە، تا هەر بە تەنیا (نالی) بخوات، چونکە (نالی) دەڵێ: ئەگەر (ئەو) ئەم کارە نەکات، ئەوا (خەم) سەری هەموان دەخوات.. با بۆ ئەم مەبەستە و ئەم وێنە شیعرییانە، سەیری ئەم نموونانە بکەین.

**١- نەوعە ئینسانێ هەیە، غەم قووتییە**
**من غەمی خۆم و غەمی عالەم دەخۆم**
**٢- غەم دەڵێ: (نالی) کە غەمخواریيم نەکا**
**ناعیلاجم من بەنی ئادەم دەخۆم**


نالی





(دیوانی- ل٢٩٨)

نموونەی تری نزیکایەتی لەم وێنە شیعرییانەی نێوان (نالی)و (کوردی)دا، ئاماژە بەم نموونانەش دەکەین:

لە بەیتی (٣)ی دیوانی کوردیدا، ئەم بەیتە هەیە:

**لەسەر حەق بن، نیگەهدارتان خودایە**

**موبارەک بێ هەزار دەفعە سەراتان**

(دیوان-ل٣٦٠)

(نالی) دەڵێ: **زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم**

**موبارەک حەجلەبێ، بۆ بووک و زاوا**

(دیوان- ١٢٣)

بەیتی (٩)ی دیوانی (کوردی):

**بەچی وا خوڕڕەمن، ئاخر لەبۆ کێ؟**

**نیکاحی باتڵە ساز و سەواتان**

(دیوان- ٣٦٠)

(نالی)دەڵێ:

**حەلاڵی بێ نیکاحی حووری عەینم**

**بەجووتێ نازیری شەرع و فەتاوا**

(دیوان-ل١٢٢)

بەیتی (١٠)ی دیوانی (کوردی):

**منیش بۆ ئاخرە، دادو فیغانم**

**مەکەن ئیخلافی ئەو وەعدەی کەداتان**

(دیوان- ٣٦٠)

(نالی) دەڵێ:

**مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت**

**دەخیلت بم، کە خانەی صەبرەکەم سووت**

(دیوان- ١٤٨)

جگە لەمانەش، کاکڵەی شیعرەکە، یەکێتییەکی بابەتی یەکگرتووی تێدایە، کە ئەم دیاردەیە لە زۆربەی شیعرەکانی (نالی)دا بەرچاومان دەکەوێ و کەمتر لە شیعری (کوردی)دا دەبینرێ.

سەرباری هەموو ئەمانەش، ئەوەندەی ئێمە (نالی) دەناسین، زۆرتر وەک شاعیرێکی ئاوارە و دەربەدەر و



**مستەفا بەگی کوردی**
**هێڵکاری- قەرەنی جەمیل-**
**ئەرشیفی (رامان)**

سەرهەڵگرتوو دەیناسین، کە ئەم شیعرە، ئەو سیما گەورە پڕ سەفەر و کۆچ ڕۆحیی و هەمیشەییەی تێدایە.

**ئەنجام:**

١- وەک لە سەرەتاشدا ئاماژەمان پێکرد و وتمان بەو هۆیەوە کە ئەم جووتە شاعیرە ناودارە: (نالی) و (کوردی)، لە قۆناغێکی مێژوویيدا هاوڕێ بوون و پێکەوە ژیاون و هاوکات لەناوجەرگەی ڕووداوە تاڵ و شیرینەکانی میرنشینی بابانیشدا تێکەڵ بوون و شەپۆلی ئەو ڕووداوانەش لەگەڵ خۆیاندا ڕایان داون و تووشی گەلێ کارەسات و ئاوارەیی و دەربەدەریی و سەرهەڵگرتنی نا بەدڵ و ناچاری بوون و ئەمانیش، کە وەک (شاعیر) هەستیان لە هەستی خەڵکی تر شاعیرانەتر بووە و شیعریان بۆ ئەو بۆنە و ڕووداوانە نووسیوە، مەرج نەبووە هەردووکیان وەک یەک، بۆ هەموو بۆنە و ڕووداوێک، فەریحەیان هاتبێتە کوڵ و شیعریان نووسیبێ، بەڵکو دەشێ (یەکێکیان) شیعری بۆ ئەو بۆنە و ڕووداوە نووسیبێ و ئەویتریان لە بۆنە و ڕووداوی تردا، شیعری هاوڕێکەی لەسەر زار بووە و کردوویەتییە سەر مەشق و چەند بەیتێکیشی لە شیعرەکەی خۆی ئاخنیبێ، کە ئەمە لە ڕەوشت و یاسای شیعردا پێی دەوترێ (خواستن) و بەعەرەبی (تزمین)ە و ئەمجۆرە خواستنە، لە نێوان شیعرەکانی (بێسارانی، مەولەوی تاوەگۆزی و ئەحمەد بەگی کۆماسی) دا هەبووە.

٢- بە سۆنگەی ئەو هەلومەرجەوە بێت، کە نەتەوەی کورد، یان میرنشینی تێدا ژیاوە و میرنشینەکە لەناوبراوە و هەڵتەکێنراوە و ڕووناکبیرانی ئەو ڕۆژگارەش، لەناوچەکەدا نەماون و سەریان هەڵگرتووە و زۆرینەی کتێبخانە و دەستنووس و بەڵگەنامەکانی ئەو ڕۆژگارە، نەپارێزراون و فەوتاون و نەوەکانی ئەو سەردەمە و دوای ئەوان و نەوەی ئێستای ئێمەش، کە نرخ و بایەخی دەستنووس و ئەرشیف و بەڵگەنامە و

تەنانەت مێژووش نازانین، هەموویان بوونەتە سۆنگەی ئەوەی یادگارەکانی ئەو شاعیرە مەزنانە، وەک سەدان و هــەزاران شتی تری بەکەڵکمان لەناو بچن، بۆیە تەماویی بوونی ناسنامەی شیعری شاعیرێکمان، لەگەڵ شاعیرێکی ترماندا، تـاوان و سووچی ئەو شاعیرانە نییە، بەڵکو تاوان و سووچی نەوەکانی دوای ئەوانە، کە بەتەنگ پاراستن و پارێزگاری شوێنەوارە جێماوەکانی ئـەو سەرمەشق و ڕابـەرانـەوە نـەبـوون، کە زمـان و فەرهەنگ و کولتووری ئێمەیان بە زیندوویی ڕاگرتووە.

٣- لەنێوان ئەو چەند دەقە شیعرەی دیوانی (نالی) و (کوردی)دا، کە ناسنامەی شیعرێک لەنێوان (نالی) و (کــوردی)دا بـزر دەبـێ و بە دوای دۆزینــەوەیـدا دەچین، تەقەللاکانمان لەو بازنەیەدا دەسووڕێنەوە، کە بەهۆی پێشتر ئاشنایەتی و دڵبەستەبوونمانەوە بە شیعرەکانیانەوە، سەلیقە و چەشی شیعرییمان، یارمەتیمان دەدەن، تا بتوانین مـۆرک و شەقڵ و سنعەتسازیی و کەش و هەوای شیعرەکانیان بناسینەوە و لە یەکتریان جیابکەینەوە.

لەم کلاوڕۆژنەیەوە و سەبارەت بەم شیعرەی نێوان (نـالـی)و (کـوردی)، بە پشتیوانی ئـەو نموونانەی هێنامانەوە، من پێموایە:

١- سەرومڕی شیعرەکە، کار و سەلیقە و سنعەتسازیی (نالی) بەسەرەوە زاڵە.

٢- بەڵام هەموو بەیتەکانی ئەم شیعرە، هی (نالی)نین، بەڵکو کاری (کوردی)یشیان تێدایە، بەتایبەتیش ئەو دەقەی دیوانی (نالی)، کە (٧)بەیتە و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی ئامادە و چاپیان کردووە، بە شیعری (نالی) دەزانم.



## پەراوێز

(١) ڕاوەگـزنـگ (ڕەخـنـە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی، محەمەد حەمە باقی، حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق، وەزارەتــی ڕۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتــی ڕۆشنبیری، هەولێر١٩٩٨.

(٢) مامۆستا محەمەدمستەفا:حەمەبۆر، پێش چاپی ئەو دیوانەی (کوردی)بەئاگاداریی کاک بەدران ئەحمەد حەبیب، بـەرپـرسـی دەزگــای (ئــاراس)، سەرجەمی دەستنووسە ئامادەکراوەکانی دیوانی (کوردی) بە من سپارد تا بەو شێوازەی دیوانی ( (ئەدەب: عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیـوان)م ڕێکخستووە و چاپکردووە، دیوانی (کوردی)یش بەو جۆرە ئامادەی چاپ بکەم. بەڵام دوایـی، کە ئەو هەموو پەراوێزە یەکجار درێژ و سەرنج و لێکدانەوە و لێدوانە لابەلایانەم بینی، بۆ شیعرەکان کراون و شیعرەکانی (کوردی) بوون بە ژێر دەست و پێی ئەم هەموو پەراوێز و تێهەڵکێشە زیادانەوە، پۆزشم بۆ ئەم داوایەی مامۆستا محەمەد مستەفا هێنایەوە، کە ئەمەیش چیرۆکێکی خۆی هەیە و بۆ ئێرە، هەر ئەوەندە بەسە.

(٣) دیوانی کوردی (مستەفا بەگی ساحێبقڕان)، چاپی دووەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦١، ل٣٥.

(٤) دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، فاتح عەبدولکەریم، محەمەدی مەلا کەریم، چاپەمەنیی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغداد، ١٩٧٦، ل٣١٧-٣٢٠.

(٥) دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە و نووسینی دکتۆر مـارف خـەزنـەدار، چاپەمەنیی وەزارەتی ڕاگەیاندن، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغداد، ١٩٧٧.

(٦) دیوانی نالی، ل ٣١٧.

(٧) دیوانی کوردی: مستەفا بەگی (کوردی)ی ساحێبقڕان، لێکۆڵینەوەی: محەمەد مستەفا (حەمەبۆر)، چاپەمەنیی (ئاراس)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٣٦١-٣٦٢

(٨) کوردی- ش لەم چەند نموونەیەدا، وشەی (بڵا=بلا) ی بەمجۆرە بەکارهێناوە:

**١- ئەرێ یاران! بلا (کوردی)، لە بۆتەی فیرقەتا یەکجار**
**خۆلاسە و بێ غەش و مەقبوولی عالەم، قاڵترین زەڕبم**

(دیوانی کوردی، ل٢٩٤)

**٢- واقیعا شیرین سوئالێکە، بڵا لێکین دەبوو**
**مەسئەلە بڕوا بەلای شەخسێکی داناو حاڵزان**

(دیوای کوردی، ل٣٩٢)

**٣- جوملە سادات و مەلا و حاج، بڵا شین کەن بەسۆز**
**دەفتەری ئەهلی وەزایف، سەر هەتا پێ، حەک کران**

(دیوانی کوردی، ل٣٩)

**٤- حەلقەدەن یاران بڵا، ئاشوفتە بەخت و تیرە دڵ**
**ڕۆژگار دنیای لە ئێمە کردە گیسووی دڵبەران**

(دیوانی کوردی، ل٣٩٧)

# بیبلیۆگرافیای (کوردی)ی شاعیر
# (مستەفا بەگی ساحێبقڕان)
# لە ناوەڕۆکی کتێبی کوردیدا



ئامادەکردن: بوار نورەدین

هەروەک لە ڕۆڤاری تایبەت بە شادڕەوان (ئەمین زەکی بەگ)دا، بابەتێکمان بەهەمان مەبەست ئامادە کرد، وا لەم بابەتەشدا و بەهەمان شێوەی بابەتەکەی پێشوو، ئەم بابەتە ئامادە دەکەین. لەبابەتەکەی تریشدا، هەندێ سەرنج و تێبینیمان نووسیبوو کە پێویستە لێرەشدا ئەمانە بنووسینەوە:

١- ئەو بیبلیۆگرافیایەی کە چەند ساڵێکە کاری لەسەر دەکەین و بۆ ئەم جۆرە بابەتانە کەڵکی لێ وەردەگرین -کە تاکو نووسینی ئەم بابەتە نزیک بە ٦٠٠٠ ناونیشان لەبارەی کولتووری کورد و کوردستانەوە کۆکراوەتەوە..- تەنها لەبارەی (کتێبی کوردی)یەوەیە -لە سەرەتاوە تاکو ساڵی ٢٠١٠-، هەروەها گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنها ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەک (کتێب) دووبارە چاپ کراونەتەوە. لەهەمانکاتدا، کتێبی بە زمانەکانی: عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی... نەگرتووەتەوە.

٢- لە دەستنووسی (بەرگی سێیەم)دا کە تایبەتە بە (ئەدەب «تیۆر- ڕەخنە- لێکۆڵینەوە- وتار») کە زۆرتر لە ١٠٠٠ کتێبی لەخۆگرتووە... چەند سەرنج و تێبینییەکمان نووسیوە، کە پێویستە تەنها ئەم سەرنجەیان لێرەدا بنووسین: لە ئامادەکردنی بەرگی ناوبراودا، (دیوان)ی شاعیرانی نەگرتووەتەوە، هەروەها ئەو کتێبانەشی نەگرتووەتەوە کە تەنها بەرهەمی شاعیرانیان کۆکردووەتەوە وەک- ئەنجوومەنی ئەدیبان-، بێگومان لەبەرئەمەیە کە لێکۆڵەران لە دۆزینەوەی دیوانی شاعیراندا دانامێنن... بەڵکو ئەوە بەلامانەوە جێی بایەخ بووە کە نووسەران و لێکۆڵەران لەو بابەتانە ئاگادار بکەینەوە کە لەبارەی شاعیرانی کوردەوە نووسراوە؟ لەهەمانکاتدا، ئەو دیوانانەی گرتووەتەوە کە جگە لە کاری کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەم و هۆنراوەی شاعیرانی کورد، کاری لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەشیان ئەنجام داوە.

٣- ئەم بیبلیۆگرافیایە بەپێی ساڵ ئامادە کراوە. لەناسنامەی کتێبەکاندا، ئەم چەند هێمایە بەکارهاتوون: (چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم، چ: چاپخانە، ش: شوێن، س: ساڵ، ل: لاپەڕە، ق: قەوارە «بە سانتیمەتر»). هەروەها بۆ هەر سەرنج و تێبینییەکی تر لەبارەی ناساندنی سەرچاوەکانەوە، خوێنەر دەتوانێت بۆ ئەم کتێبە بگەڕێتەوە: بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی تایبەت بە کورد و کوردستان: ١٩٢٥- ٢٠١٠ «بەرگی یەکەم: مێژوو»، ئامادەکردن: بوار نورەدین، چاپی یەکەم- چاپخانەی «سەردەم» سلێمانی- کوردستان، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٢.

سەرەتا سێ کتێب دەناسێنین کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریان لەسەر (کوردی)ی شاعیر کردووە:

**١. فەرهەنگی دیوانی شاعیران- نالی- سالم- کوردی**

نووسەر: د. محەممەد نوری عارف

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٩، ل: ١٠٢٤، ق:١٧×٢٣.

ناوەڕۆک:

پێشەکی (لێرەدا نووسراوە: ...بەپێویستم زانی فەرهەنگێ لەم بارەیەوە بنووسم. دیارە ئەمەش کارێکی زۆر درێژخایەنە و گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئەمە سەرەتایەکە و تەنها لە سێ شاعیرەوە دەستم پێ کرد کە «نالی و سالم و کوردی»یە و ئەمانە بە پێشەوا و سەرەتای شیعری کرمانجی خواروو دانراون... هەروەها نووسراوە: ئەم فەرهەنگە سەرەتایەکە بۆ دانانی فەرهەنگێکی گەورە لە پاشەڕۆژدا و یارمەتیدەرێکە بۆ ئەوانەی کە لە زەمینەی شیعری کۆنماندا کاردەکەن، بەشێ لە وشەکانی ئەم فەرهەنگە لە شیعری شاعیرانی پێش سێ شاعیری ناوبراو و دوای ئەوان بەکارهاتوون...)/ فەرهەنگێک بەپێی ڕیزبەندی تیپەکان کە جگە لە شیکردنەوەی وشەکان، نموونەی لە بەیت و شیعرەکانیش داناوە.../ سەرچاوەکان.

**٢. دیوانی کوردی- مستەفا بەگی «کوردی»ی ساحێبقران- بەرگی یەکەم**

لێکۆڵینەوەی: محەممەد مستەفا (حەمەبۆر)

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠، ل: ٦١٦، ق:١٦×٢٣.

ناوەڕۆک:

پێڕستی بەرگی یەکەم و دووەم/ پێشەکی/ ژیاننامەی کوردی- هەندێ بابەتی وەک: پێشدەستی/ ساحێبقران/ ئەحمەد بەگی گەورەی ساحێبقران/ کوردی لە کوێ لە دایک بووە؟/ خوێندنی کوردی/ دڵداریی کوردی/ کوردی و بەیتبێژی و چیرۆکنووسی/ دۆزینەوەی گۆڕی کوردی/ مردنی کوردی/ کوردی لای گەورە پیاوان.../ هەڵبەستی کوردی بەلای سەرچاوەکانیەوە/ نرخاندنی کوردی لە ئێران/ داهێنەری هەڵبەستی بابانی کێ بووە؟/ هاندەرانم لە کاری ئەم دیوانەدا/ سەرچاوەکان/ دیوانی کوردی.../ مۆسیقا و ئاوازی کوردی...

(لەتەواوی هەردوو بەرگی دیوانەکەدا، نووسەر شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیەکی ورد و چڕوپڕی لەسەر هۆنراوە و

بەرهەمەکانی «کوردی» کردووە و دەیان سەرنج و تێبینی و پـەراوێـزی لەسەر نووسیوە و هـەزاران وشەشی لێک داوەتەوە ...).

لەسەر بەرگی دواوە کورتەیەک لە بارەی (کوردی)یەوە نووسراوە.

**٣. دیوانی کوردی- مستەفا بەگی «کوردی»ی ساحێبقران- بەرگی دووەم**

لێکۆڵینەوەی: محەممەد مستەفا (حەمەبۆر)
لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠، ل: ٦٠٧، ق:١٦×٢٣.

ناوەڕۆک:

پێڕستی بەرگی یەکەم و دووەم/ بەشێکی تر لە هۆنراوەکانی کوردی...

(لەتەواوی هەردوو بەرگی دیوانەکەدا، نووسەر شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیەکی ورد و چڕوپڕی لەسەر هۆنراوە و بەرهەمەکانی «کوردی» کردووە و دەیان سەرنج و تێبینی و پەراوێزی لەسەر نووسیوە و هەزاران وشەشی لێک داوەتەوە ...).

لەسەر بەرگی دواوە هۆنراوەیەکی (کوردی) دانراوە.

***

ئەمانەش ئەو کتێبانەن کە لە ناوەڕۆکەکانیاندا، باس و لێکۆڵینەوەیان.... لەسەر (مستەفا بەگی ساحێبقران «کوردی») کردووە:

١. مێژووی ئەدەبی کـوردی- مێژوو، ئـەدەب، زانیاری/ نووسینی: عەلائەدین سەجادی، چاپ: یەکەم، چ (مەعاریف)، ش: بەغداد، س: ١٩٥٢: دەوری دووەم لە ئەدەبی کوردی/ هۆنراوە (شیعر)/ هەڵبەست لە کورددا/ کوردی.

٢. باخچەی شاعیران- بەسەرهات و هەڵبەستی ٤١ بوێژی کورد/ کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی: عەبدولعەزیم ماوەتی و عەبدولقادر سالح، چاپ: یەکەم، چ (ژین)، ش: سلێمانی، س: ١٩٧٠: پێشەکی: شاکر فەتاح/ کورتەی ژیان و نموونەی بەرهەمی ٤١ شاعیری کورد...: کوردی ١٨٠٩- ١٨٤٩.

٣. مێژووی ئەدەبی کـوردی- مێژوو، ئـەدەب، زانیاری/ نووسینی: عەلائەدین سەجادی، چاپ: دووەم، چ (مەعاریف)، ش: بەغداد، ١٩٧١، چاپی دووەمی کتێبی ژمارە یەکە...

٤. لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە- بریتییە لە چواردە لێکۆڵینەوە/ نووسینی: د. مارف خەزنەدار، چاپ: یەکەم، چ (المؤسسه العراقیه للدعایه والطباعه)، ش: بەغداد، س: ١٩٨٤: مولەممەع لە شیعری کلاسیکی کوردیدا: نالی/ سالم/ کوردی.

٥. مێژووی وێژەی کوردی- نووسراوی ٢/ نووسەر: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشاراتی (نـاجـی) لە بانە، چـاپ: یـەکـەم، چ (چهر تبریز)، س: ١٣٧٥ (١٩٩١): هۆنەرانی دەوری بابان: مستەفا بەگی کوردی.

٦. ڕاوە گزنگ- ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی/ نووسینی: محەممەد حەمە باقی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: ؟، چ (ڕۆشنبیری)، ش: هەولێر، س: ١٩٩٨: شیعرێک لە نێوان (نالی) و (کوردی)دا.

٧. ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی- لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی/ نووسەر: عەزیزگەردی، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ (دێکان)، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٣: کێش و قاڵبە عەرووزییەکانی شیعری کلاسیکی کوردی/ زیحاف و عیللەی قاڵب داڕێژ/ هەندێ تێبینی لەبارەی کێشە عەرووزییەکانی شیعری کلاسیکی کوردی/ کارکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمی ٨٢ شاعیری کورد (کە یەکێکیان «کوردی»یە... ژمارەی شیعرەکان و ژمارەی کێش و قاڵبەکێشی هەر شاعیرێک و ڕێژەی سەدییان (خشتە)/ کێشی شیعرە درێژەکان.

٨. مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم/ ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، دانانی: د. مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ (وەزارەتی پەروەردە)، هەولێر، س: ٢٠٠٣: بەشی دوازدیەم: کوردی/ ژیانی کوردی/ ڕوخساری شیعری کوردی/ ناوەڕۆکی شیعری کوردی/ بەشی سێزدیەم: گوڵبژێری دیوانی کوردی/ سەدای کاروانی فیرقەت/ وەسفی یار/ موناجات/ پەرێشانی و پاڕانەوە/ دووری لە یار/ عیشق و عاشق/ بەزمی ڕەندان و کۆڕی عاشقان/ لەسایەی نالیدا/ وەسیەت و ماتەمنامە و ماڵاوایی...

٩. یاقووت و زمرووتی کوردیی- ئایین و فەلسەفە (بەرگی دووەم)/ نووسەر: حسێن محەممەد عەزیز، لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ (شڤان)، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٤: هەوێنی هۆنراوەی کوردی/ ئایین و فەلسەفە/ کوردی.

١٠. ڕوناهی- کۆڤارەکا کوردی بوو د ناڤبەرا ١٩٦٠-١٩٦٢ێ دا ل بەغدا دەرکەتییە/ دانان: حافز قازی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگـای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیرێز، چـاپ: دووەم؟، چ (وەزارەتـی پـەروەردە)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٥: ڕوناهی ژمارە ٢ سالا ٢: سکاڵای مستەفا بەگی کوردی: عەبدولڕەزاق محەممەد.

١١. پایەی وەفایی لەناو شاعیرانی سـەدەی نۆزدەیەمی کرمانجی خوارووادا/ نووسەر: مستەفا سەید مینە مستەفا، لەبڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن، چاپ: یەکەم، چ (؟)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٦:





بەشی یەکەم: بزوتنەوەی شیعری کوردیی کرمانجی خواروو لەسەدەی نۆزدەدا/ سەرهەڵدانی شیعری بابان/ دامەزرێنەرانی قوتابخانەی شیعری بابان/ ...مستەفا بەگی کوردی ١٨١٢- ١٨٥١. بەشی دووەم: وەفایی ١٨٣٠- ١٨٩٩/ کاریگەری نالی و کوردی لەسەر وەفایی.

١٢.خوێندنەوەیەکی تازەی هەڵبەستی کوردی/ نووسینی: عەبدولڕەزاق بیمار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ (وەزارەتی پەروەردە)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٦: سەرەتا/ هەڵبەستی کوردانە لە کەلەپووری سەدەی نۆزدەمیندا... مستەفا بەگی کوردی.

١٣.گەڕان بەدوای ماناکانی شیعردا – خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەک لە شیعری کوردی/ نووسینی: عەتا قەرەداغی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ (حەمدی)، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٦: ئازادی لە جوگرافیای خەیاڵەوە بۆ واقیع لە شیعری (چاوەکەم زانیوتە بۆچی..)ی (مستەفا بەگی کوردی)دا.

١٤. مێژووی وێژەی کوردی- بەرگی دووەم/ نووسینی: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٨، چاپی دووەمی کتێبی ژمارە پێنجە...

١٥. شەجەرەی بنەماڵە دێرینەکانی سلێمانی- بنەماڵە دێرینەکانی سلێمانی لەنێوان ساڵانی ١٧٨٤-١٩١٤/ کۆکردنەوە و ساغکردنەوە و ئامادەکردنی: عەبدولخالید سابیر، چاپ: دووەم، چ (گرین گلوری)، ش: لوبنان- بەیرووت، س: ٢٠٠٩: شاری سلێمانی لە دیدی شاعیراندا/ شاری سلێمانی لە دیدی شاعیراندا/ بنەماڵەکانی سلێمانی: ... ساحێبقڕان (چاپی یەکەمی ئەم کتێبە کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا چاپ بووە، ناوی بنەماڵەی «ساحێبقڕان»ی تێدا نەهاتووە...).

١٦. مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم/ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم ١٨٠١- ١٨٥٠، دانانی: د. مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠: چاپی دووەمی کتێبی ژمارە هەشتە...

١٧. بەهائوڵڵا لە کوردستان- وردەکاریی کۆچی حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ کوردستان/ نووسەر: ئەمیر فەرهەنگ نیمایی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: دڵشاد کەریم- ئاسۆ، چاپ: یەکەم، چ (ڕوون)، ش: سلێمانی، س: ٢٠١٠: بەشی حەوتەم: نامەکەی حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ ناودارانی کورد/ شیعرەکانی مستەفا بەگی کوردی لە وەسفی حەزرەتی بەهائوڵڵا و مژدەی نزیکبوونی ئاشکرا بوون...

# نامەیەکی مستەفا بەگی کوردی بۆ حەسرەتی وەڵامی سالم بۆ کوردی و حەسرەتی



کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

لە دونیای ئەمڕۆدا کە پێی دەڵێن: جیهانگەرایی، ئینتەرنێت بە فەیسبووک و جیمەیڵ و یاهوو... موبایل و تەلەفوونیش کە ئێستەکە باوە لەنێو دونیای ئەمڕۆدا، بە کورتە نامە و مەسج و کۆڵ و نازانم چی و چی، هەواڵی یەکتر دەپرسین و دەپرسترێت...

جاران لەنێو شاعیران و نووسەران و ئەدیبان و مەلا و میرزا و زانایانی کۆندا، هەواڵ پرسین بە فەیسبووک و ماسنجەر و کورتە نامەی مۆبایل نەبووە، هاتوچۆ و ئەم شار بۆ ئەو شار و، ئەم گوند بۆ ئەو گوند بە ئۆتۆمبێلی ئاخر مۆدیل و بە تەبرید و ساردکەرەوەی فوول مواسەفات نەبووە، بەڵکە بە گوێدرێژ و ئەسپ و نامەی سەر کاغەز ئەگەر کەسێک بڕۆشتایە بۆ شار و گوند دەبوو، ئەمەش تا چەند ساڵێکی نزیکیش هەروەها بووە...

هەر ئەم نامانە تاکو ئێستاش پڕن لە سۆز و موحیبەت، پڕن لە خۆشەویستی پاک و بێگەرد، پڕن لە سەرگوزەشتەی جوان و، پڕن لە مێژووی گرنگ و بەڵگەی ڕاستگۆیی و سەلمێنراو و بایەخدارن بۆ نەوەی ئەمڕۆ، ئەگەر نەوەی ئەمڕۆ قەدری بزانن.

ئەم نامەیەی کە لە بەردەستدایە، یەکێکن لەو نامانەی کە پڕە لە موحیبەت و خۆشەویستی نێوان دوو شاعیر کە دۆست و هاودەمی یەکتر بوون، دەمانێک ئەم دوو هاوڕێ خۆشەویستە نامە گۆڕینەوەیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە، بەنامەی شیعری هەواڵی یەکتریيان پرسیوە و خەمی یەکتریان بە با داوە...

یەکێک لەو نامانەی کە ئێستاکە بەدەستی ئێمە کەوتووە و دەمانەوێ بە خوێنەری ئازیزی بناسێنین، دوو نامەی حەسرەتی و کوردییە، لەگەڵ شیعرێکی سالمی ساحێبقڕاندا کە دەکرێتە ناواخنی ئەم باسە...

مامۆستا حەمەبۆری خۆشەویست لە دیوانی موستەفا بەگی کوردی دا، ئاوڕی لەم نامانەی کوردی و حەسرەتی داوەتەوە، بەڵام بەهەندێ بیر و بۆچوونی جیاوازەوە، کە ئێستاکە ئێمە پێچەوانەی وتەکانی ئەو قسانێک دەکەین.

موستەفا بەگی کوردی و سالم، نامە گۆڕینەوەیان لەگەڵ یەکتری دا هەبووە، بەڵام ئەوەی تاکو ئێستا من بینیبێتم تەنها مامۆستا حەمەبۆر ئاماژەی پێ کردووە، لەم باسەدا ئاوڕێکی تریش لەو بابەتە دەدرێتەوە.

حەسرەتی و کوردی و سالم، سێ شاعیری هاودەمی یەکتربوون، تاکو ئێستا هیچ کەسێک لەم ڕوانگەوە هیچی نەوتووە و بەڵگەی باوەڕ پێکراوی تەواومان لەبەردەستدا نییە جگە لەم سێ پارچە هۆنراوەی هەر سێ شاعیر نەبێت.

مامۆستا حەمەبۆر لە بەرگی دووەمی دیوانی کوردییدا لە لاپەڕە (٨٢) دا دەڵێت: شایانی دەستنیشان کردنە کەوا (حەسرەتی) (نازناو)ی (مەلا عومەر) ناوێک و هاواڵ و هاوچەرخی (کوردی) بووە و من بە (مەلا عومەر)ی (ڕەنجووری)* دەزانم کە ئەشێ ئەویش جگە لە نازناوی (ڕەنجووری) نازناوی (حەسرەتی) یشی بووبێ، وەک (سالم) نازناوی (بیمار) و (کوردی) نازناوی هیجریشی هەبووە و ئەگەر ئەم (حەسرەتی)یە، ئەو ڕەنجوورییە نەبێ کەوا (مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی) دیوانێکی نایابی لە سەر ئامادەی چاپ کردووە، ئەوا لەوەندە پتری لێ نازانم کە (کوردی) هەڵبەستی (قەوسی ئەبرۆ و موژەت تیر و کەوانە بە عومەر)ی بۆ ئەو گوتووە. وەک لەوێدا نیشانەم بۆ کردووە، بەڵام وەڵامەکەی ئەو مەلا عومەر (حەسرەت)یەم یا (ڕەنجووری)یەم، دەست نەکەوتووە کە بۆ (کوردی)ی نووسیوە، ئەوە بەرامبەر بەو هەڵبەستەی تری (کوردی) نابێ....

مامۆستا حەمەبۆر لەم بابەتەدا ئەگەرچی شارەزاییەکی باشی هەبووە، بەڵام لە هۆنراوەی (قەوسی ئەبرۆدا...) زۆر پێداگری لەوە دەکات کە ئەو شیعرە هی کوردییە و هی حەسرەتی نییە، لە دەستنووسێکدا کە کۆپییەکم لە مامۆستا حەمە ڕەشیدی ئەمینی پاوەیی وەرگرتووە، ئەم دوو نامە شیعرییەی موستەفا بەگی کوردی و حەسرەتیم تێدا بینییەوە، زۆربەی شیعرەکانی ئەم دەستنووسە هی کوردی و نالی و فکری و حەسرەتی و... کۆی شیعری شاعیرانی نێو ئەم کەشکۆڵە نزیکەی (٥٠) شاعیری کورد و فارسن و شیعری کوردی و فارسی و عەرەبی شاعیرانی کوردیی تێدایە، قەبارەکەی دەستنووسەکەش بریتییە لە (١٦×٢٣سم) و ئەوەی ماوەتەوە لە کەشکۆڵەکە ٢٢٨ لاپەڕەیە، بەپێی دوایین لاپەڕەی وا دەردەکەوێت کۆتاییەکەی لێی فەوتابێت.

بەڵام لەم دەستنووسەدا دوای ئەوەی شیعرەکەی کوردی



نامەی مستەفا بەگی کوردی بۆ حەسرەتی

نووسراوە، شیعرەکەی حەسرەتی دێت و لە سەری نووسراوە (حسرتی در جواب)، دواتر دەچێتەوە سەر شیعرەکانی کوردی و لە سەرەتایانەوە نووسراوە (ولە)، من لەگەڵ ڕای مامۆستا حەمەبۆردا نیم و دەڵێم: ئەم هۆنراوەی (نیم نیگای دولبەری من، دڵ دەرفێنی، بە عەلی) هی موستەفا بەگی کوردییە، هەروەها هۆنراوەی (قەوسی ئەبرۆ و موژەت تیر و کەوانە بە عومەر) هی حەسرەتییە، بەڵگەشم بۆ قسەکانم ئەم کەشکۆڵەیە کە لەسەر زۆربەی شیعرەکان ناوی شاعیرەکانی نووسیوە، لێرەشدا نووسیویەتی (حەسرتی در جواب)، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەم هۆنراوە هی حەسرەتییە نەک کوردی، ناوهاتنی حەسرەتیش لە کۆتاییدا بەڵگەیەکی ترە، جگە لەوەش دەبینین ناوەڕۆکی نامەکەی کوردی جۆرە پرسیارێکە لە حەسرەتی و دەڵێت: بە عەلی، حەسرەتیش کاتێک وەڵامی دەداتەوە دەڵێت: بە عومەر.
مامۆستا سەرچاوەکانی هەڵبەستی قەوسی ئەبرۆ دەکاتە سێ بەشەوە:

بەشی یەکەم: ئەم بەشەیان هەڵبەستەکەیان بە هی (کوردی) داناوە ئەوانیش (عن، گل/١، مس، کو، ف، نم/١، کم، گ/١، گ/٢، س)ن.

من، بەپێی ئاشنایەتیم لەگەڵ هەڵبەستی (کوردی) دا، (شێوە) و (سۆز) و (مۆرک)ی تیا ڕەچاو دەکەم.

هەر بۆیە (عـن)م کـردە بنکە و دەسکەلای لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی ئەم هەڵبەستە کە ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا یەکەمینە....

بەشی دووەم: لە سەرچاوەکاندا ئەم بەشەیان هەڵبەستەکەیان بەهی (بیمار) یا (سالم) داوەتە قەڵەم، ئەویش بەوەدا کە لە هەشتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەدا وشەی (بیمار) هەیە، دەبێ ئەوەش دیاری بکەم لە (بیمار) نازناوی سەرەتای ژیانی (سالم) بووە، بەم پێیە هەڵبەستەکەیان بەلاوە یا هی (سالم) و، یا هی (بیمار)ێکی تر بووە و، ئەوانیش (ن، س/٢)ن کە من پشتگیریی ئەم خاوەن دیاریکردنی هەڵبەستەکەیان ناکەم.

بەشی سێیەم: لە سەرچاوەکانی ئەم بەشەدا هەڵبەستەکە هی (حەسرەتی)یە، چونکە لەو (هەشتەمین) تاکە ناوبراوەدا، (ناو)ی حەسرەتی هاتووە، ئەوانیش (گل/٨، گل/٩) وە پەراوێزی (کم و س/١)ە کە لەو پەراوێزەدا نووسراوە: (ئەم غەزەلە بەناوی (حەسرەتی)یەوە لە یەک دوو جێگادا نووسراوە)....
مامۆستا حەمەبۆر زۆر پێداگری لەوە دەکات کە ئەم هۆنراوە هی کوردییە بەناوی (کۆهکەن) یان بەیتی (حەوتەم)، ئەی ئەگەر حەسرەتی بەیتی (حەوتەم)ی تێکەڵاوی غەزەلەکەی خۆی کردبێت، ئەی ئەوەیان چی؟!

ناتوانین ئەو ڕایە بڵێین کە حەسرەتی بەیتێکی کوردی هێناوە و ئاوەخنی هۆنراوەکەی خۆی کردبێت؟! لێرەدا کەوانەیەک بۆ باسەکەم دەکەمەوە و دەڕۆمە سەر باسی شیعرێکی (سالم) و لێرەدا ناواخنی ئەم بابەتەی دەکەم و سەرەباسێکی دیی دەهێنمە ناوەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە ئەم شیعرە هی حەسرەتییە، لە کەشکۆڵی نەجمەدین مەلادا لەکۆی شیعرەکانی سالم لە یەکێک لە کەشکۆڵەکانی دا هاتووە و دەڵێت:

**قامەتت سەرووی ڕەوانە بە حوسێن**
**عاریزت باغی جینانە بە حوسبن**
**شەربەتم زەهرە لە دووریت بە حوسێن**
**زیندەگیم دەردی گرانە بە حوسێن**
**غەیری دووری نییە سەیل و یەرەقان**
**هەر فیراق قابیلی جانە بە حوسێن**
**هێرشی لەشکری غەم، نەوعی یەزید**
**وا لە دڵ زەخمی زەمانە بە حوسێن**
**دڵ لەبەر تیری نیگاهی غەمزەت**
**ڕووبەڕوو میسلی نیشانە بە حوسێن**
**(سالم)ی تو شنەی هیجرت بە عەلی**
**پەیڕەوی ڕێگەی ڕەوانە بە حوسێن**

نەجمەدین مەلا نیشانەی (چ، ن)ی بۆ دانـاوە، واتە: چاپ نەکراوە، ئەم هۆنراوە لە دیوانی سالمی چاپکراوی گیو موکریانیدا نەهاتووە و لە بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالمی مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغیشدا نییە.

لە کۆی باسەکەدا بۆ ئەم شیعرە چەند بەڵگەیەک دەهێنمەوە..

١- قامەتت سەرووی ڕەوانە بەحوسێن: سالم لێرەدا بەشداری ئەم نامانەی حەسرەتی و کوردی دەکات و دەڵێت: بە (حوسێن)، لە سەر هەمان کێش و وەزن و ڕێگا....

٢- سالم لە باسی دووری ئەواندا دەڵێت: شەربەتم وەکو زەهری مارە...

٣- سالم لە دوا بەیتیدا دەڵێت: هیجرت بە عەلی، سوێند بە عەلی دەخوات و دەڵێت: پەیڕەوی ڕێگەی ڕەوانە بە حوسێن، واتە: پەیڕەوی ڕێگەی (حەسرەتی و کوردی) ڕوون و ئاشکرایە سوێند بە حوسێن.

٤- هاتنی ناوی یان وشەی (بیمار) لە شیعرەکەی حەسرەتی دا، نیشانەی ئەوەمان نیشان دەدات کە حەسرەتیش ئاگاداری شیعرەکەی سالم بووە، بەپێی وشەی (بیمار)، وا دەچێت حەسرەتی دوای سالم شیعرەکەی نووسیبێت.

دەتوانین لە کۆی باسی ئەم سێ شیعرەدا ئەمەش بڵێین نامەکەی حەسرەتی و سالم و کوردی بەم شێوە بێت: یەکەمجار کوردی نامەکەی نووسیبێت، دواتر سالم شیعرەکەی نووسیوە، دوابـەدوای ئەوە حەسرەتی شیعرەکەی خۆی نووسیوە، یان کوردی هۆنراوەکەی نووسیوە و حەسرەتی وەڵامی داوەتەوە و ناوی (بیمار) واتە: (سالم)ی هێناوە، سالمیش ئەو پارچە شیعرەی نووسیوە، هاتنی ناوی (بیمار) وادەچێت کە حەسرەتی بە سالمی وتبێت (بیمار) و نەیزانیبێت کە سالم ناوی خۆی گۆڕیوە بە (سالم) بۆیە ناوی بیماری هێناوە، سالمیش لە



شیعرەکەدا وتوویەتی (سالم) کەواتە ناوی من هێستاکە (سالم) ە نەک بیمار... یان لە بۆچوونێکی تردا کە بەڵگەدار ترە ئەوەیە کە سالم دەڵێت: سالمی تینووی دووری ئێوەم بە عەلی و پەیڕەوی ڕێگەی ئێوەم کردووە...

لە ڕاستی دا بەپێی دوا بەیتی شیعرەکەی سالم وا دەردەکەوێت سالم دواجار شیعرەکەی نووسیبێت، چونکە دەڵێ ڕێگەی ڕەوان، ناڵێت: ڕێگای ڕوون، سالم ڕووی دەمی بۆ دوو کەسە نەک یەک کەس، ئەمەش پتەومان دەکات لە سەر ئەوەی بڵێین، سالم دواجار شیعرەکەی نووسیوە.

بەڵگەیەکی دیی لە سەر ئەوەی کە هۆنراوەی قەوسی ئەبرۆ هی حەسرەتییە، تەماشایەکی ئەم بەیتە دەکەین: (بە عەلی سوێندت دەدەم، شیعەی ئەگەر ڕەحمت بێ ..... خۆ ئەگەر سوننەی ئەی شۆخی زەمانە، بە عومەر) حەسرەتی سوێندی بە عەلی دەدات ئەگەر شیعەیە، خۆ ئەگەر سوننەشە سوێندی بە عومەر دەدات، کەچی عومەر و عەلی و ئەبوو بەکر و عوسمان و حوسێن و... لەلای سوننەکان ڕێزی تایبەتییان هەیە، لەلای شیعەکانیش تەنها عەلی، بەڵام لێرەدا حەسرەتی دووبەرەکییەکی دروستکردووە لەنێو هەڵبەستەکەیدا، بەڵام لەلای کوردی ئەوە بەدی ناکرێت، ئەمەش هەردوو هەڵبەستەکەی کوردیی و حەسرەتییە، کە مامۆستا حەمەبۆر بڵاوی کردۆتەوە بەناوی یەک کەسەوە، واتە بە ناوی (موستەفا بەگی کوردی)یەوە هێناویەتی.

نامەکەی موستەفا بەگی کوردی بۆ حەسرەتی:

**نیم نیگای دولبەری من، دڵ دەڕفێنێ، بە عەلی**
**نووکی پەیکانی موژەی، خوێن دەتکێنێ، بە عەلی**
**چاوی مەخمووری، لە خاوی سەحەری هەڵساوە**
**بادەیی ساغیری عوشرەت دەڕژێنێ، بە عەلی**
**تیرەکەی ئەمرۆ کە هێناویەتە سەر گۆشی برۆ**
**شیشە و جامی صەبووحی دەشکێنێ، بە عەلی**
**تاری کاکۆڵی کە ئەفشانە لە سەر مەیتەنی ئاڵە**
**ڕوشتەیی جان و دڵ و دین دەپسێنێ، بە عەلی**
**نەقدی فرمێسکی لە دەست مەردومی چاو، سەند بە (حوکم)**
**باج لە دەست مەردوەی ئاوی دەستێنێ، بە عەلی**
**مایەیی عەشقی وەها (پوختە دەکا) مەردومی خاو**
**خوێن لە جەرگ و دڵ و دیدە دەمەیێنێ، بە عەلی**
**(قادر)ە (کوردی) لە بۆ حەشری هەمووەمان (قادر)**
**عەشقی ئەو، زیندە دەکات و دەمرێنێ، بە عەلی**

وەڵامی حەسرەتی بۆ کوردی:

**قەوسی ئەبرۆ و موژەت، تیر و کەمانە، بە عومەر**
**نیگەهت قەیدی دڵە، ئافەتی جانە، بە عومەر**
**تیرە بارانی نیگاهت لە دڵی عاشقی زار**
**تیژ و سۆهان زەدە، وەک نووکی سنانە، بە عومەر**
**بە شەرارەی غەمی تۆ نەخلی مورادم سووتا**
**باغی شادیم هەموو دەم فەسڵی خەزانە، بە عومەر**
**تێغی ئەبرۆی خەمت، سوورەتی سەیفی (عەلی)یە**
**باعیسی زەمزەمە و شووری جیهانە، بە عومەر**
**بە (عەلی) سوێندت دەدەم، (شیعە)ی ئەگەر ڕەحمت بێ!**
**خۆ ئەگەر (سوننە)ی، ئەی شۆخی زەمانە، بە عومەر**
**پەڕتەوی عاریزی یار و دڵی سەد پارەیی من**
**قسەی شەوقی مەهوو، چاکی کەتانە، بە عومەر**
**(حەسرەتی) نەماوە ئەگەر کۆهکەنی بیمارم**
**دولبەرم هەر وەکو شیرینی زەمانە، بە عومەر**

وەڵامی سالم بۆ کوردی و حەسرەتی:

**قامەتت سەرووی ڕەوانە بە حوسێن**
**عاریزت باغی جینانە بە حوسێن**
**شەربەتم زەهرە لە دووریت بە حوسێن**
**زیندەگیم دەردی گرانە بە حوسێن**
**غەیری دووری نییە سەیل و یەرەقان**
**هەر فیراق قابیلی جانە بە حوسێن**
**هێرشی لەشکری غەم، نەوعی یەزید**
**وا لە دڵ زەخمی زەمانە بە حوسێن**
**دڵ لەبەر تیری نیگاهی غەمزەت**
**ڕووبەڕوو میسلی نیشانە بە حوسێن**
**(سالم)ی تو شنەی هیجرت بە عەلی**
**پەیڕەوی ڕێگەی ڕەوانە بە حوسێن**

**سەرچاوەکان:**


١- کەشکۆڵێکی بێ ناو و نیشان کە لە مامۆستا حەمە ڕەشیدی ئەمینی پاوەییم وەرگرتووە، لە جێگایەکی ئەم کەشکۆڵەدا نووسراوە: لە سەردەمی ڕەزا شای پەهلەوی نووسراوە، ١٣٩٠ی ١٤ی شعبان.

٢- کەشکۆڵی مینای شکستە: بەقەڵەمی نەجمەدین مەلا، بەرگی یەکەم، لە ٩-٦-١٩٤٠ دا نووسیویەتییەوە.

٣- دیوانی کوردی (مستەفا بەگی «کوردی»ی ساحێبقڕان): لێکۆڵینەوەی محەمەد مستەفا «حەمەبۆر»، بەرگی یەکەم و دووەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.

٤- بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم: محەمەد عەلی قەرەداغی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.

٥- مێژووی ناودارانی کورد «عارفان، زانایان، وێژەوانان، شاعیران»: بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی (شیوا)، و- ماجد مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، لە کتێبەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر- ٢٠١١.

٦- شاعران کرد پارسی گوی: سید عبدالحمید حیرت سجادی، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیام، نشر احسان، تهران، ١٣٧٥.

# خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی دیوانی مستەفا بەگی کوردی



د. ڕەئوف عوسمان

مامۆستا حەمەبۆر لە دوو بەرگی قەشەنگ و قەوارە گەورەی تێر وپڕدا، دیوانی مستەفا بەگی (کوردی) ساحێبقڕانی بە چاپ گەیاند و چاوی خوێنەری کوردی پێ گەش و ڕووناکتر کردەوە و بەم هەوڵە نەوازە و پڕ لە ماندووبوون و دڵسۆزانەیەی خزمەتێکی گەورەی ئەدەبی بەرهەم هێناوە و کتێبخانەی کوردی ئاوەدان و دەوڵەمەند کردووە.

لە سێبەری ئەم بەرهەمە دلۆڤانەدا، هەوڵدەدەم چەردەیەک سەرنج و تێبینی تایبەت، لەمەڕ موستەفا بەگی کوردی و خودی کارەکەی مامۆستا حەمەبۆر بخەمە بەر دیدی خوێنەرانی کوردەوە.

١- لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا جاران وا دەوترا کە (نالی) لە ڕووی کات و بابەتەوە سەرامەدە لە هۆنینەوەی شیعری کلاسیکی کوردیدا و سەر قافڵەی کاروانی شیعری کلاسیکییە، بەڵام مامۆستا حەمەبۆر بە بەڵگەوە سەلماندوویەتی کە (کوردی) پتر لە دەهەیەک بەر لە نالی شیعری لەم جۆرەی وتووە و ئەسپی هونەرمەندانەی خۆی لەم بوارەدا بەگوڕ تاوداوە، نەک هەر ئەمەش، بەڵکو بەر لە سێ کوچکەی بابانیش (نالی، کوردی، سالم) شاعیری تر هەبوون کە بە هەمان نەزم شیعریان وتووە.

ئەم ڕوونکردنەوە و سەلماندنە بۆ ئەم نەوە نوێیە تا بڵێی کارێکی چاک و خزمەتگوزارانەیە، دیارە لەم بوارەدا نووسەری تریش هەن کە دەستیان بۆ ئەم بابەتە بردووە، بەڵام کارەکەی مامۆستا حەمەبۆر ورد و ڕەسا و دۆکیۆمێنتاری ترە.

٢- واتای موفرەداتی نێو بەیتە شیعرەکان، بە مەبەستی زانینی ڕاڤەی بەیتەکان بە تێروتەسەلی خراونەتە ڕوو، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا بەرەو بە فەرهەنگ بوون و قەبە بوون ڕۆیشتوون و مەبەستی سەرەکی ون بووە، یەک وشە چەندان واتای جۆربەجۆری بۆ داناوە، تەنانەت هەندێک وشە هێند ئاسانە پێویستی هەر بە ڕاڤەکردن نییە! با

ئەوەش نەبوێرم کە لە زانستی زماندا وشەی (مرادف) هاو واتای سەد دەرسەد کەمن!! ڕاڤەی ئەم فرە واتاییەی وشە، ئاستی دەوڵەمەندی مامۆستا حەمەبۆر دەردەخات لە بواری زمان زانیدا، بەڵام لە هەمانکاتیشدا ئەم فرە واتاییە دەبێتە هۆی دەرچوون لە گەوهەری واتای خودی بەیتەکە، خۆ لەوانەشە بۆ هەندێک خوێنەری تازەکورە بە نێگەتیف بکەوێتەوە، چونکە پێدەچێت واتای وشەیەک هەڵبژێرێت کە نەگونجێت لەگەڵ مەبەستی سەرەکی بەیتەکەدا، بە بۆچوونی بەندە باشتر وابوو، واتای ئەو وشانەی بدایە کە نزیکن لە ئاو و هەوای بەیتەکەوە و هێند دوور نەکەوتایەتەوە لە مەبەستی سەرەکی.چونکە کاری بنەڕەتی ئەو ناساندنب واتای بەیتەکانە، نەک قوڵبوونەوە لە زماندا.

٣- کاک حەمەبۆر لە ڕاڤەی بەیتەکاندا، هەندێک جار بۆچوونێک دیاری دەکات، کە ناگونجێت و دوورە لە واتای بەیتەکە و تناسب نییە، لەوانەیە بەرێزی وای پێ باش بێت کە ئەو بۆچوونە دوورەدەستانە لە بەرژەوەندی توانا و لێهاتوویی مستەفا بەگە! بەڵام ئەم (تحمیل) بارکردنە قورسە، مەرج نییە لەگەڵ ویست و خواستی کوردیدا بێتەوە، لە هەموو حاڵەتێکدا (المعنی فی قلب الشاعر) گرنگ پەی بردنە بەو واتایە، کوردی دەڵێت:

**لەناو فیکر و خەمانی کاکۆڵت قوربان وەها ماتم**(١)
**شەو و ڕۆژ نابزووم ئەصلا نە بەم لادا نە بەو لادا**

ئەگەر (ماتم) لێک چواو بێت بە مەلیکی مردووی شەترەنج، دەبێت فیکر و کاکۆڵی لوول، فیل و ئەسپ و ڕوخ بن!! دیارە ئەمە هاوکێشەی یاری شەترەنج دروست ناکات، لەلایەکی ترەوە (خەمانی کاکۆڵ) پڕ، بە پڕ کاکۆڵی لوول دەگرێتەوە و بەهیچ شێوەیەک (خەفەتەکانی) ناگرێتەوە و نەدەبوو مامۆستا مێشکی خوێنەر بۆ ئەوە ڕاکێشێ!

حەزدەکەم نموونەیەک بۆ (تناسب) لە واتای شیعردا بخەمە بەر دیدی خوێنەری ئازیزەوە، (کوردی) دەڵێت:

**لە حەسرەت ئەو قەدو باڵای وەکو نەی** (٢)
**دڵی من پڕ لە ئەفغان و خرۆشە**

(نەی) کە شمشاڵە زۆر جار ئاوازەکەی پڕ لە (گریان و خرۆشە) واتە تناسب هەیە لە نێوان (نەی لەلایەک فغان و خرۆش لەلایەکی ترەوە) ...مامۆستا لە ڕاڤەی وشەی (ناسۆر) دا دەڵێت:

**دڵ وە چاکە زامەکەی ناسۆری تیری تانەبێ** (٣)
**سینە بۆ نیشی مژانی مەهروان نیشانە بێ**

ناسۆر: جۆرە برینێکە، کولانەوەی برین، زامی بەئازار پێش تۆزێک وتم (ترادف) هاو واتای سەد دەر سەدی وشە دەگمەنە، لێرەدا مامۆستا سێ واتای ڕیز کردووە، مەرج نییە هەموو برینێک پڕ ئازار بێت! لەم بەیتەدا ناسۆر بەواتای ئازار دێت نەک برین! چونکە شاعیر وتویەتی (زامەکەی ناسۆری)، دەبوو بۆ ئەوەی کوتومت خوێنەر بگاتە مەبەست، بیوتایە مەبەست لە ناسۆر ئازارە لەم بەیتەدا! دیارە دەیان نموونەی لەم جۆرە لە دیوانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت.

٤- زۆرجار مامۆستا حەمەبۆر چامەکەی بەستۆتەوە بە بۆنەی (مناسبە) وتنی چامەکەوە و دەستنیشانی زەمین







بەرگی یەکەم و دووەمی دیوانی کوردی

و زەمانی هۆنینەوەی چامەکە و تەنانەت دەستنیشانی ئەو کەسانەشی کردووە کە پەیوەندییان بە باتەکەوە هەیە و لەو نێوانەشەوە ناوی گەلێ شاعیری نەناسراو و ناسراو و شیعرەکانیشیانی بە نموونە هێناوەتەوە، دیارە لەم نێوانەوە ئاوڕی لە نەریتی کۆمەڵایەتی لە پۆشین و دابو نەریت و هەڵسوکەوتی سەردەمەکە داوەتەوە، دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم ئەم دیوانی کوردییەی مامۆستا حەمەبۆر جۆرێکە لە ئینسکلوپیدیای ڕاڤەی شیعری کلاسیکی کوردی و تا ئێستا بەرهەمی وا نەوازە و تێر و تەسەل لە زانیاری فرە مەودا، نەهاتۆتە کتێبخانەی کوردییەوە و ئەمە جێگای دەستخۆشییە.

٥- ئەگەر بەراوردێکی ئەکادیمیانەی بابەتی، لە نێوان مەنهەجی ڕاڤەی دیوانی نالی و مەحوی لەگەڵ ڕاڤەی ئەم دیوانەدا بکەین، هەرچەندە پرۆگرامی ڕاڤەی هەردوو لایەنی هاوکێشەکە جیاوازە، بەڵام ئەمەی مامۆستا حەمەبۆر تێروتەسەلترە و زانیاری وردتری سەبارەت بە نێوەندی ڕۆشنبیریی وسیاسی و کۆمەڵایەتی سەردەمەکە تێدایە و خوێنەری دیوانەکە دەباتەوە سەردەمی مستەفا بەگی کوردی بە نەریت و داب و هەڵسوکەوت و جۆری پۆشین و کەسایەتییەکانی ئەو سەردەمە و جۆری بیرکردنەوەیان و پتریش دەستی خوێنەری گرتووە بۆ زانینی واتای شیعر و موفرەداتەکانی مستەفا بەگی کوردی، واتە لێکۆڵینەوەیەکی تۆکمەی خستۆتە بەردیدی خوێنەران.

٦- مامۆستا حەمەبۆر بۆ زانینی واتای زۆربەی بەیتە شیعرەکان، بە تەنیا ڕاڤەی وشەکانی کردووە و ئازادی و بەرپرسیارێتی داوەتە دەست خوێنەر بۆ لێکدانەوەی واتای شیعرەکان، ئەم ئازادی بەخشینە بەخوێنەر، یەکێکە لە بنەماکانی تێوری هیرمونتیکا (التاویلیە) و لە ئەنجامدا دەبێتە دەوڵەمەندکردنی دەق و وەک تۆدۆرۆڤ و ڕۆڵان پارت دەڵێن « مردنی داهێنەر لێرەوە دەست پێدەکات، دیارە بەپێی ئەم مەنهەجە، ئەوە دەقە کە خوێنەر هەڵدەسەنگێنێ و دەیخوێنێتەوە، نەک نووسەری دەق، ئەوە خوێنەری دەقە کە بۆتە خاوەنی تێکستەکە و بە ئارەزووی خۆی شەن و کەوی دەکات، ئەم مەنهەجە بەشی خۆی کێشەی هەیە و ئاو زۆر دەبات، بە تایبەت بۆ خوێنەری کەم بەهرە، چونکە ڕخنەگران پێیان وایە کە خاوەن دەق تووشی خەم و داچڵەکین دەبێت بەدەست خوێنەری کەم سەوداوە.

٧- هەندێک جار مامۆستا حەمەبۆر کەوتۆتە بەرداشی نێوان چەند بۆچوونێکەوە، کە دەبوو گونجاوترینیان (ترجیح) بکات، بەڵام جار هەیە لایەنی نەویستراو و لاوازی هەڵبژاردووە و ملی دەقە شیعرییەکەی بە ویستی خۆی باداوە و نەیویستووە شەن و کەوی گونجاو لە نێوان موفرەداتی بەیتەکەدا بکات، هەر بۆ نموونە لە چامەی (تاکەی بکێشم)دا دەڵێت:

**نەشئەی فیراقی تۆیە کوڕەی سوخمە قرمزی (٤)**

**وا لێ و بە بارم، ڕەنگ زەرد و سینە چاک**

سەیرکەن بۆ واتای (کوڕەی) چەند شتی وتووە: مەبەست لە دەنگ گڕی بووە، کە دەنگی عەزیز بەگ گڕ بووە، یا پیاوێکی ئاگرین بووە!!

ئەی بۆ هەر پێ داناگری لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە (کوڕە) هەر عەزیز بەگ بووە و هیچی تر؟!

لەهۆنراوەی (تاکەی ئەم جەور و جەفایەت) دا دەڵێت:

**ئەی تەبیب ئەر تۆ تەماتە زامی دەردم چارەکەی(٥)**

**تاکە گەرما و گەرمە بۆی پەیدا بکە شەهدی ویصال**

کاک حەمەبۆر خۆی دەڵێت لە جیاتی (بـۆی) (بۆم) گونجاوترە، بەڵام هەر (بۆی) داناوە، نازانم بۆ؟! خۆ لە بەیتە شیعرەکانی سەروو خۆیەوە (کوردی) هەر ڕاناوی کەسی یەکەمی بەکارهێناوە،تەنانەت لە نیوە دێڕی یەکەمی بەیتەکەدا وتوویەتی (دەردم) و نەیووتوە (دەردی) ئیتر نازانم لێرەدا بۆ ڕاناوی (ضمیر) کەسی سێیەم گونجاوترە؟! لەلایەکی ترەوە من وای بۆ دەچم کە بەیتەکە یان هەڵەی چاپی تێدایە، یان مستەفا بەگی کوردی تووشی غەفڵەت بـووە، ئەوێک کە تاکەی گەرما و گەرم بێت و وەخت بێت بسووتێت، خۆ شەهد کە هەنگوینە هێندەی تر دەیسووتێنێت و دەیکوژێت!! دیارە لێرەدا موعادەلەی گونجاندن لەق دەبێت و واتا لەدەست دەچێت! باشتر وابوو کاک حەمەبۆر پێی لەسەر ئەم لایەنانە دابگرتایە لە هەڵسەنگاندنەکانیا، نەک هەر پیاهەڵدان و تێپەڕبوونی خێرا.

لە بواری شیکردنەوەی تێکستدا (تولیف) گونجاندن یەکێکە لە خەسڵەتە هەرە گرنگەکانی گەیشتن بە واتای گونجاو، ئەو وشەیەی کە لە فڵانە ڕستەدا واتایەک دەدات بە دەستەوە لە ڕستەیەکی تردا واتاکەی بە جۆرێکی ترە، نابێت ئەوەش فەرامۆش کەین، کە هیچ وشەیەک ناتوانرێت لە بنەڕەتدا خەسڵەتی جوانیی، یان پێچەوانەکەی پێ ببەخشرێت و بە ڕەهایی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، ئەهەمیەتی هەر وشەیەک لە شیعر یان پەخشاندا بەبەر و دواوەیەتی، نەک هەر ئەمەش، بەڵکو پاش و پێش خستنی وشەش گۆڕانکاری گەورە لە ڕستەدا فەراهەم دێنێ، چونکە (جون کوین و



تشوسکی و دی سوسێر)پێداگری لەم بوارەدا دەکەن، هەر بۆ نموونە هێمن موکریانی دەڵێت (ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە)، واتە کەس و شتی تریشم لەبیرە و هەر تۆ نیت! خۆ ئەگەر هێمن بیوتایە (ئەمن ئەی نیشتمان هەر تۆم لەبیرە) دیارە لەم حاڵەتی پاش و پێشی وشەی (هەر)ەدا واتاکە دەگۆڕێت و ئیتر هێمن جگە لە نیشتمان کەسی تری لەبیر نامێنێ، زانینی ئەم بابەتە گرنگە لە زانستی بەلاغەدا بۆ ڕاڤە و شیکاری هۆنراوە و دەرخستنی ستاتیکای داڕشتن، زۆر پێویستە و دەشێت ئاوڕی لێ بدرێتەوە و لە ناوەڕاستی ڕێگادا بەجێ نەهێڵرێت، چونکە بـواری لێکۆڵینەوە فرە مەودایە و لک و پۆپی بابەتی جودای لێدەبێتەوەو خۆی دەهاوێتە بواری زانستی (علم المعانی)ەوە.

٨- لەبەرئەوەی کارەکەی مامۆستا حەمەبۆر ئێجگار ناوازەیە و هەوڵێکی لە ڕادە بەدەری دڵسۆزانەیە، دەبوو لە کۆتاییەوە پێڕستی ناو و شوێنی بۆ بکردایە، چونکە لەو دوو بەرگەدا ناوی کەس و جێگای فرە هاتوون و ناوەکانیش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان هەیە بە دنیای ئەدەب و زانست و باری کۆمەڵایەتی و مێژوو و سیاسەتەوە و زۆربەی شانۆی ڕووداو و بەسەرهاتەکانیش کوردستان و دەوروبەرن و ئەهەمیەتی خۆیانیان هەیە، بەتایبەت بۆ لێکۆڵەرەوە و خەڵکە پرۆفیشناڵەکان.

٩- سەرنجێکی وردی ڕەخنەگرانە لە توانا و مامەڵەی ورد لەگەڵ دنیای داهێنانی شاعیرانەی نالی و کورددیدا، گەیاندوومیەتە ئەو ئەنجامەی کە هێندەی ڕووناکبیری ئایینی و مێژوویی و بیری قووڵ و خەیاڵی فـراوان لە هۆنراوەکانی نالیدا ڕەنگی داوەتەوە، لای کوردی بەهەمان ئاست نییە.

لەلایەکی ترەوە هۆنراوەکانی کوردی لە بیر و خولیای خەڵکە ئاساییەکەوە نزیکترە وەک لە هۆنراوەکانی نالی، چونکە ئەو موفرەداتەی کوردی لە شیعرەکانیا بەکاری دەهێنێ زۆربەی خەڵکەکە پێی ئاشنان و تەنانەت بڕێکی زۆریان وشەی ڕۆژانەی خۆیانە، بۆ بەڵگەی بۆچوونەکەم بڕوانە ئـەم چامانە (وەکـو قومری ل٢١٥، ئەگەرچی قەلبەکەم ل٩٩، پارەیەکی خۆی کۆنە فاحیشە ل٧٦، ئۆف خودا ل٥٠، بۆ منی بێکەس ل١٣٦).

لەڕووی شاعیریەتەوە هەردووکیان ڕووە و بەلوتکە بوون دەچـن، بـەڵام وزەی خـوڕ و ڕەوان و حـازر بەدەستی شیعرەکانی و زەقی شاعیریەتە خۆڕسکەکەی (مطبوع) کوردی، لەبەرئەوەی گەلێجار خەیاڵی فراوان و بیری قووڵی

وەک نالی نەهێناوەتە گۆڕێ و کەمتر پێوەی ماندوو بووە، دەبینین زووتر و بێ گرێ و گۆڵتر دەچێتە نێو خورپەی دڵەوە، نەک مێشک و بیرەوە، بەڵام لای نالی حاڵەتەکە وا کەوتۆتەوە کە وزەی شاعیریەت و بیری قووڵ و خەیاڵی فراوان لە مەداری داهێنانێکی نەوازەتردا ئەدرەوشێتەوە و سنعەتکاری پێوەدیارە.

نابێت ئەوەش لەیادکەین کە شیعرەکانی سەردەمی لاوێتی نالی، هەمان خوڕ و ڕەوانی شیعرەکانی کوردی پێوە دیارە. لەلایەکی ترەوە ئەگەر بەراورد لە نێوان هۆنراوەی کەم بڕشتی هەردوولا بکەین، دەبینین لای نالی هۆنراوەی لاواز کەمترە وەک لەلای کوردی، لە هەمانکاتیشدا هۆنراوەی لێوان لێو لە داهێنان و دلۆڤان، لای نالی پترە لە کوردی، بە تایبەتی هۆنراوەکانی سەردەمی پیرییەتی نالی.

دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین کە هۆنراوەکانی (کوردی) سـەردەمـی غەریبـی و ئـاوارەیـی ئێران و دڵشکان لە کاربەدەستانی بابان، پڕاو پڕن لە هەستی پاک و ڕاستگۆیی هونەری و ڕەوانـی وشەکان و ئیقاعاتی پڕ لەخەم و هارمۆنیای مرۆڤ هەژێن، وەک هۆنراوەی (فەلەک ڕەحمێ ل٣٢٦، شۆری ئەم جارە ل٩٠..هتد).

هـەنـدێ بابەتی غـەزل و سـکاڵای دووری و شیعری (اخوانیات) لای کوردی پترن وەک لە لای نالی و مستەفا بەگ لە ساراتینی ئەم سێ بابەتەدا تەنیا سوارچاکە و نالی پیاراناگات!

بەڵام لای نالی (وصف) لە هەر بابەتێکدا بێت ئێجگار باڵادەستە و بارگاویە بە عەقڵێکی ئەندازەیی کە سۆز و ڕاچەنین ڕەنگیان ڕشتووە و بەرەو کەشکەلانی داهێنانیان بردووە و کردوویانەتە لوتکەیەکی باڵای شیعری خۆرهەڵات، دیـارە فـراوانـی خـەیاڵەکەی، هەسوونێکی قایمی ئەم وەسفەیە، بۆ گەورەیی و باڵادەستی کوردی لە بواری غەزەلدا بڕوانە: (چاوەکەم زانیوتە ل٣٠٢، ئەمان مردم ل١٣٧، لەغەم شاری دەرون ٤٩١، عەزیزم لە دووریت ل٣٢٠، صەدای ل٥٥٠، هەروەها لاپەڕەکانی ٥٢٥، ٤٤٨، ٤٥٦).

نابێت ئەوەش لەیاد کەین کە گەلێ هۆنراوەی (کوردی) لە ڕووی داهێنان و پێوانەکانی شیعری سەرکەوتووەوە، لە ئاست نالییایە و هیچی لەو کەمتر نییە، بڕوانە چامەی (جانا وەرە ٢٨٨، ڕەفیقی کونجی میحنەت٣٣٨..هتد).

١٠ ڕێژەی بەکارهێنانی وشەی کوردی لای مستەفا بەگ زیاترە لە نالی، بە پێچەوانەوە نالی زیاتر لە مستەفا بەگی کوردی وشەی عەرەبی لە شیعردا بەکارهێناوە، هەرچەندە

هەردوکیان دەرچووی مزگەوتن، بەڵام نالی عەرەبی زانترە لە مستەفا بەگی کوردی، ئەمە جگە لەوەی مستەفا بەگ لە نالی زیاتر فارسی زانیووە، بۆیە وشەی فارسی زیاتر بەکارهێناوە لە شیعرەکانیدا، تەنانەت زۆر شیعری فارسی جوانیشی نووسیووە، دیارە ئەم بەراوردکارییەش لە خودی دیوانی هەردوو شاعیرەکەوە هەڵهێنجراوەو دەشێت لەنێوان ئەم بەراوردانەدا کەسایەتی شیعریی مستەفا بەگ باشتر هەڵسەنگێنین و جوانتریش دەستنیشانی وزەکانی بکەین لە نێوان سێ کووچکەی شیعری باباندا.

١١- پەیوەندی کوردی بە گەورە پیاوانی سەردەمەکەیەوە، لە پانتاییەکی گەورەدا خۆی دەنوێنێ، بە تایبەتی میرانی بابانی وەک عوسمان بەگی بابان و ئەحمەد پاشا و عەبدوڵڵا پاشا و عەزمی بەگی بابان، ئەمە جگە لە گەورە پیاوانی ئیلی جاف و شاعیرە بەناوبانگەکانی سەردەمەکەی وەک سالم و فیکری و صابری و غەوسە و گەورە پیاوانی میرنشینی ئـەردەڵان، ئەم پەیوەندییە فراوانە ئاسۆی شیعری (اخوانیات)ی لەبەردەم کوردیدا کردۆتەوە.

با ئەوەش لەیاد نەکەین کە خودی کوردی لە بنەماڵەیەکی ناوداری سلێمانییە، کە بنەماڵەی ساحێبقڕانە و ئەم ماڵباتە بەڕێزە پەیوەندییەکی فراوانی بە بنەماڵە ناودارەکانی ئـەوی کاتی سلێمانییەوە هەبووە و خوشکی مستەفا بەگی کوردی (پیرۆز خان) هاوسەرگیری لەگەڵ شێخ عەبدولڕەحمانی نێرگسەجاڕدا کردووە و موستەفا بەگی کوردیش بۆتە خاڵۆی شێخ مارفی نێرگسەجاڕ کە یەکێک بووە لە کەسایەتییەکانی ئەو سەردەمەی سلێمانی و وەک دەما و دەم بیستوومە لە ئێرانەوە هۆنراوەیەکی پێشکەش بە شێخ مارفی نێرگسەجاڕ کردووە و هەوڵی فرەم دا بۆ دەستخستنی و وادەشیان پێدام، بەڵام مەرگ بواری کاک جەمال موفتی بەهەشتی نەداو لە دەستم دەچوو، ئیتر نازانم دەستنووس و دۆکۆمێنتەکانی کاک جەمال کەوتنە کوێ؟.

١٢- سەبارەت بە هــەردوو هۆنراوەی (دەروون زامـدار ل٤٥٦، لە وێرانەی دەروونم ٤٤٨، نازانم بۆ کاک حەمەبۆر کردویەتییە دوو هۆنراوە، باشتر وابوو بیکاتە یەک هۆنراوە و ئەو بەیتانەی کە زۆر نزیکن لە یەکەوە وەدەری نێ.

١٣- گیانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لای مستەفا بەگ، هەمیشە لە کڵپەدا بووە و دەشێت بکرێتە بابەتێکی سەربەخۆ و تێر و تەسەل و پانتاییەکی فرەی بۆ تەرخان کرێت، سەیری هۆنراوەی (لەجێگەی شێرکوژانی بەبە ل٢٥١) بکە، چۆن چۆنی و بێ ترس و لەرز، گاڵتە بە ئاکاری هەڵسوکەوتی عەبدوڵڵا پاشای بابان دەکات، چونکە دەستی بێگانە و داگیرکەرانی کوردستانی کێشاوەتە سلێمانی، هەروەها هۆنراوەی (زەمانی فیرقەتی یارانە ١٣٦)، کە باسی کارەساتی ڕووخانی مەحموود پاشای بابان دەکات، هۆن هۆن خەم و پەژارەی لێ دەتکێت و گیانی کوردایەتییەکی پاکی تێدا دەبینرێت.

١٤- لە (تحقیق)ی دیوانی کوردیدا هەست دەکرێت کە هەڵە و کەموکووڕی زۆرە و هۆکاری سەرەکیش (نساخ) ەکانی دیوانەکەیە، لەوەدەچێت کەسیان ئاگای لەوی تر نەبووبێ و بە ئارەزووی خۆیان شەن و کەویان تیا کردبێت، ئەمە جگە لە جیاوازی ڕێنووسی ئەوسا و ئێستا، دیارە ئەمەش کێشەیەکی ترە، ئەم حاڵەتانە بوونەتە شێوانی واتا و کێش و ستاتیکای شیعرەکانەوە و کاک حەمەبۆریش ئاماژەی فرەی بەم کەموکووڕییانە داوە و بەدەستییەوە ماندوو بووە.

١٥- ئەوەی کە کتێبەکەی هێندەی تر گرانبەها کردووە دەستنیشانی نامە شیعرییەکانی نێوان کوردی و سالم، کوردی و صەیدی هەورامی، کوردی و صابری، کوردی و فیکری، کوردی و مەلا عومەری ڕەنجوری، کوردی و غەوسە، ئەگەر کاک حەمەبۆر نەبوایە ئەم هەموو زانیارییانەمان لەدەست دەچوو، دیارە کۆکردنەوەی ئەم هەموو زانیارییانە بەڵگەی نەفەس درێژیی و دڵسۆزی کاک حەمە بۆرە بۆ سەرخستنی لێکۆڵینەوەکەی.

١٦- ئەم کـارە گـەورە و دلۆڤانەی مامۆستا حەمەبۆر گەواهی ئەوەیە کە یەکێک لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستان دکتۆرایەکی فەخری پێشکەش بکات، چونکە هەم تەحقیقە و هەم ڕاڤەیە و هەم لێکۆڵینەوەیە و هەم دەریایەک زانیاری نوێی سەردەمی مستەفا بەگە. چونکە هەندێ دکتۆرام دیوە لەم بـوارەدا، کە بە هیچ شێوەیەک ناگاتە ئاستی ئەم بەرهەمە و لە پەراوێزیایەتی، دیارە نامەوێت ناوی هیچ زانکۆ و کەسێک خوانەخواستە بزڕێنم.

**پەراوێزەکان:**

١-دیوانی کوردی-بەرگی یەکەم-لێکۆڵینەوەی محەمەد مستەفا حەمەبۆر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس-هەولێر ٢٠١٠ ل٤٧.

٢-دیوانی کوردی بەرگی یەکەم ل ٦٠٤.

٣- دیوانی کوردی بەرگی دووەم ل١٠٨.

٤- دیوانی کوردی بەرگی یەکەم ل١٦٤.

٥- دیوانی کوردی بەرگی یەکەم ل٢٧١.



رۆڤار
75



# مستەفا بەگی کوردی

شەهسواری بەلاغەتی کوردان.
یەکە تازی فەصاحەتی بابان
مستەفایە تەخەلوسی کوردی
غەزەلی کردە بەرِیووتی کوردی

حاجی قادری کۆیی

گاران Designer

# شێوازی شیعری (مستەفا بەگی کوردی) لە (لەیلەکەی بێ مەیلەکە)دا



ناز ئەحمەد سەعید
خوێندکاری دکتۆرا لەزمان و ئەدەبی کوردیدا

**لەیلەکەی بێ مەیلەکەی،مەحبووبەکەی ، عەییارەکەم**
**شۆخەکەی ، بەدبەختەکەی، بێ ڕەحمەکەی، غەددارەکەم**
**زاڵمەی ، لە خودا نەترسەی ، کافرەی ، بێ مروەتە**
**قاتیلەی ، عاشق کوژەی ، جەللادەکەی ، خونخوارەکەم**
**گوڵ بەدەن ،سیمین زەقەن ، خەط یاسەمەن ، فندق دەهەن**
**ئەسمەرەی ، قەد عەرعەرەی ، ناز و نەزاکەت دارەکەم**
**لەیلەکەی ،چاو مەستەکەی ،دڵ بەستەکەی،نەوڕەستەکەم**
**حووریی (جەنناتو ، تەجری تەحتەهالئەنهار)ەکەم**
**نەوجوان ، ئەبرۆکەمان ، شیرین زوبان و، نوکتەدان**
**تورک ڕەفتار و ، پەری ڕوخسار و ، پەرچەم دارەکەم**
**گەر ڕەقیب صەد جار دەرم کا ، یا جنێوم پێ بدا**
**نا عیلاجم ، هەر دەبێ بێم ، بۆ صیلاحی کارەکەم**
**ژەهری دووری چەشتووە (هیجری) ئەمێستا بۆیەکە**
**تەڵخ گوفتارە کەلامی لەعلی شەککەر بارەکەم**

(دیوانی کوردی، حەمەبۆر،٢٠١٠،بەرگی یەکەم،ل٣٥٠)

بێگومان مستەفابەگی ساحێبقران ناسراو بە (کوردی)، یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکییە بەناوبانگەکانی ئەدەبیاتی کوردی، لەگەڵ هاوڕێ و هاوزەمانەکانی (نالی و سالم) بەداهێنەری بزووتنەوە شیعرییەکەی کرمانجی خواروو لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا دادەنرێن، هەرچەندە (کوردی) خاوەن دەنگێکی تایبەتی و شێوازێکی کاریگەر و بەهێزە، بەڵام لەناو ئەدەبیاتدا مافی خۆیان نەداوەتێ، تا ئێستا نەتوانراوە لێکۆڵینەوەی ورد و شیکردنەوەی فراوان بۆ بەرهەمەکانی بکرێت، جێی داخە زۆر کەمتر لە هاودەمەکانی (نالی و سالم) باس دەکرێت و تیشک دەخرێتە سەر ژیان و بەرهەمی، پشت بەخوا کارێکی وام دەست پێکردووە، کە ئیش لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی دەکەم، هیوادارم لە ئایندەیەکی نزیکدا بتوانم تەواوی بکەم.

ئەم بابەتەی ئێستاش زیاتر لێکۆڵینەوەیەکی شێوازگەرییە، دەمانەوێت لێرەوە شێوازی شیعریی و پلەی شیعرییەت و ئیستاتیکای شیعرەکە دەربخەین، بەوەی لە (ڕیتمی شیعری، پێکهاتەیی شیعری، دەلالەتی شیعری) شیعرەکە دەدوێین.

ڕیتمی شیعری

یەکەم / ڕیتمی دەرەوە ( کێش و سەروا)

١) کێش: دەقەکانی (کوردی) وەکو هەموو دەقەکانی هاوڕێکانی، لە چوارچێوەی ئەو چەمکەی شیعردا چنراون، کە کێش و سەروا بە دوو پایەی سەرەکی پێکهێنان و چنینی ڕیتمی دەرەوەی شیعر دادەنرێن، بۆیە دەبینین گرنگییەکی زۆریان پێداوە، بێگومان شیعرەکانیشیان لەسەر کێشی عەرووز داناوە، ئەم شیعرە لەسەر کێشی ڕەمەلی هەشتی مەحزووف دانراوە ،کە ئەم کێشە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا لە دوای کێشی هەزەج بەپلەی دووەم دێت لە فراوانی بەکارهێناندا، هۆیەکەشی ئەوەیە کە لەگەڵ چێژی ئاوازەیی کوردا گونجاوە، کێشێکی مۆسیقی و ئاوازبەخش و ئاهەنگدارە، جۆرە سەنگینی و وەستانێکی خۆش بەخشی تیا بەدی دەکرێت، دەتوانرێت بوترێت زۆربەی ئەو شیعرانەی لەسەر ئەم کێشەن کراون بە گۆرانی.

کێشی شیعرەکە، ڕەمەلی هەشتی مەحزووف فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن X ٢

١٥ = ١٥ ژمارەی بڕگەکانی هەر نیوە دێڕێک

**لەیلەکەی بێ \ مەیلەکەی مەح \ بووبەکەی عەی \ یارەکەم**

فاعلاتن \ فاعلاتن \ فاعلاتن \ فاعلن
**شۆخەکەی بەد \ بەختەکەی بێ \ ڕەحمەکەی غەد \ دارەکەم**
**فاعلاتن \ فاعلاتن \ فاعلاتن \ فاعلن**

دێڕەکانی دیکەش هەر بەمجۆرەیە، دەبینین ئاواز و ڕیتمێکی زۆر سەیری بەخشیوە بە شیعرەکە، هەست بە جۆش و خرۆش و جووڵەیەکی جوان دەکەین.

٢) سەروا: سەرواش شان بەشانی کێش ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەری هەیە لە بەخشینی ڕیتم و ئاواز و هاوسەنگی بە دەقی شیعری، بەتایبەتی لەم دەقەی (کوردی) دا دەورێکی باڵا و سەرەکی بینیوە لە دروستکردنی هاوسەنگی و یەکسانی و ئاوازبەخشین ،

لەیلەکەی بێ مەیلەکەی، مەحبووبەکەی، عەییارەکەم
شۆخەکەی، بەدبەختەکەی، بێ ڕەحمەکەی، غەددارەکەم
سەروای بزوێنی درێژ (ا) بەم شێوەیە لەگەڵ ا+ ر + ە کە+ م

کە دیارە چەند وەستایانە بە یارمەتی نیشانەی ناسراوی (ەکە) و جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاک (م) سەرواکەی تەواوکردووە، ئەمە جگە لە سەروا بنەڕەتییەکە کە دەنگی بنچینەیی وشەکان خۆیانن، سەروای وشەکانی دیکەی شیعرەکە بەمجۆرەیە (خونخوارەکەم، نەزاکەت دارەکەم، ئەنهارەکەم، پەرچەم دارەکەم، کارەکەم، بارەکەم)

دووەم / ڕیتمی ناوەوە

ڕۆڵی ڕیتمی ناوەوە هیچ کەمتر نییە لە ڕۆڵی ڕیتمی دەرەوە، بەڵکو تەواوکەر و یارمەتیدەری یەکترن، ئەمەش بەهۆی چەند دیاردەیەکەوە دروست دەبێت لەوانە: (سەروای ناوەوە، دووبارەکردنەوەی دەنگ، قرتاندن،.....) دەقەکانی (کوردی) یش بەگشتی و ئەم شیعرەش بەتایبەتی لە بازنەیەکی ئاوازەیی هێندە جواندایە کە بە ئاسانی هەست بە شارەزایی و توانای ئاوازەیی زمانیان تیا دەکرێت. دەتوانین بڵێین ئاواز و ڕیتمی ناوەوەی شیعرەکە زۆر دیار و کاریگەرترە لە هی دەرەوە، و هۆی سەرەکی ڕیتم و ئاوازبەخشیەکەیە، کە بەهۆی ئەم دیاردانەوە دروست بووە:

١)سەروای ناوەوە

ئەگەر سەرنجێکی وردی شیعرەکە بدەین هەموو دێڕەکان لەناوەوە سەروای خۆیان هەیە، لەگەڵ یەکدا هاوسەروا و گونجاون، هەندێ جار بەشێوەی ئاسۆیی و هەندێ جاری دیکەش بەشێوەی ستوونییە،

دێڕی یەکەم
لەیلەکەی بێ مەیلەکەی، مەحبووبەکەی، عەییارەکەم
ەکەی——ەکەی—— ەکەی ئاسۆیی و ستوونی هاوسەروان
**شۆخەکەی، بەدبەختەکەی، بێ ڕەحمەکەی، غەددارەکەم**
ەکەی——ەکەی—— ەکەی ئاسۆیی و ستوونی هاوسەروان

دێڕی دووەم
**زاڵمەی،لە خودا نەترسەی، کافرەی، بێ مروەتە**
ەی——ەی——ەی ئاسۆیی و ستوونی هاوسەروان
**قاتیلەی، عاشق کوژەی، جەللادەکەی، خونخوارەکەم**
ەی——ەی——ەی ئاسۆیی و ستوونی هاوسەروان

دێڕی سێیەم
**گوڵ بەدەن،سیمین زەقەن،خەط یاسەمەن ، فندق دەهەن**
ەن——ەن——ەن——ەن هاوسەروان بە ئاسۆیی، ژمارەی برگەکانیشیان (٢)وەک یەکە
**ئەسمەرەی، قەد عەرعەرەی، ناز و نەزاکەت دارەکەم**
ەی——ەی— هاوسەروان بە ئاسۆیی

دێڕی چوارەم
**لەیلەکەی،چاو مەستەکەی، دڵ بەستەکەی، نەوڕەستەکەم**
ەکەی——ەکەی——ەکەی هاوسەروان بە ئاسۆیی ژمارەی برگەی وشەکانیش (٣)وەک یەکە
**حووریی (جەنناتو، تەجری تەحتەهالئەنهار )ەکەم**
ی——ی هاوسەروان بە ئاسۆیی

دێڕی پێنجەم
**نەوجوان، ئەبرۆکەمان، شیرین زوبان، نوکتەدان**
ان——ان——ان——ان هاوسەروان بە ئاسۆیی
**تورک ڕەفتار و، پەری ڕوخسار و، پەرچەم دارەکەم**
ر——ر——ر هاوسەروان بە ئاسۆیی

بەمجۆرە وەک دیارە ئەو سەروایانەی ناوەوە، چ هاوسەنگی و مۆسیقایەکیان بە شیعرەکە بەخشیوە.

٢) قرتاندنی دەنگ

دیاردەیەکی سەرنجڕاکێشی دیکە، کە زۆرجار کێشی شیعری هۆکاری سەرەکی ئەم دیاردەیەیە و هەندێجاریش بەهۆی لادان لە نۆرم و شێوازی باو، شاعیر پەنای بۆدەبات، لەوانەشە ئەم دیاردەیە پەیوەندی بە شێوەزاری ناوچەیەکەوە هەبێت و لەناوچەیەکی دیکە وانەبێت، بۆ نموونە: لە ناوچەی سلێمانی زۆرجار لە گوتندا دەنگی (د) نادرکێنن کە لە ناوەڕاستی وشەکەدا بێت وەک: ئاوەدان—— ئاوا، یان (ت) کۆتایی وشە وەک دەکات —دەکا، لەوانەیە ئەمە لە نووسینیشدا پەیڕەو بکەن، لە چەندین شوێن و جێگا لە دیوانەکەی (کوردی) دا ئەم دیاردەیە دەبینین، بەڵام لەم شیعرەدا ئەگەر سەرنجی دێڕی شەشەم بدەین ئەم قرتاندنانەمان بەرچاو دەکەوێت .

گەر———ئەگەر

دەرم کا———دەرم بکات

پێ بدا———پێ بدات

دەبێ———دەبێت

٣) ڕەگەزدۆزی

واتە دوو وشە یان زیاتر لە شێوەدا لەیەک بچن، بەڵام لەمانادا جیاوازبن. ئەمەش دوو جۆرە:

ڕەگەزدۆزی تەواو: ئەو دوو وشەیە لە ڕواڵەتدا تەواو لەیەک بچن، لە ڕووی ژمارە و شێوە و جۆر و ڕیزبوون پیتەکان وەکو یەک بن، بەڵام لە مانادا جیاوازبن،

ڕەگەزدۆزی ناتەواو: ئەوەیە دوو وشەکە لە یەکێک لەو ڕووانەی باسمان کرد جیاوازبن .

لە ڕاستیدا ئەگەر چاوێک بەناو دیوانەکەی (کوردی)دا بگێڕین زۆر بەخێرایی هەست بەم هونەرە دەکەین، نەک هەر ئەوە بگرە لە زۆربەی شیعرەکانیدا بەدی دەکەین، وەکو شێوازێکی تایبەتی (کوردی) لێهاتووە. بەڵام لەم شیعرەدا تەنیا ڕەگەزدۆزی ناتەواوی تیایە، ئەویش لە وشەکانی (لەیلەکەی — مەیلەکەی) وشەی (لەیل و مەیل) یان دوو وشەی (مەستەکەی—بەستەکەی) (مەست و بەست)لێرەدا لە یەک پیتدا جیاوازن، پێی دەوترێت (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی جودا).

٤)دووبارەکردنەوەی دەنگ

ئەم دووبارەکردنەوانە هەندێ جار بەرێکی و هاوسەنگی دەبێت، هەندێ جاری دیکە دەنگەکان بە پەرشوبڵاوی بەناو دێڕە شیعرەکەدا بڵاو دەبنەوە، بێگومان ئەم دووبارەکردنەوانەش جگە لە دروستکردنی ڕیتم و ئاواز بۆ شیعرەکە، ئەرکی سیمیۆلۆجیشیان هەیە، کە زۆر دووبارەبوونەوەی دەنگێک دەلالەتی هەستی خۆشی و شادی، یان خەم و پەژارەی شاعیرە، جگە لەو دەنگانەی کە وەکو سەروا، سەروای ناوەوەیان دروستکردبوو پێشتر باسمان کرد، ئێستا ئاماژە بە چەند شێوەیەکی دیکەی دووبارەکردنەوەی دەنگ دەکەین لەم شیعرەدا.

دووبارەکردنەوەی دەنگی بزوێنی درێژ (ا) هەشت جار لەم دێڕە، هەست بە ناڕەزایی و دەنگ دڵیری و تووڕەیی شاعیر دەکەین، وەک ئەوەی هاوار بکات، کردەی ناڕەزایی پیشان دەدات و لە دواییدا ئاگادارمان دەکاتەوە و پێمان ڕادەگەیەنێت کە کۆڵ نادات و هەر دێت بۆ لای یار.

**گەر ڕەقیب صەد جار دەرم کا ، یا جنێوم پێ بدا**

**نا عیلاجم، هەر دەبێ بێم ، بۆ صیلاحی کارەکەم**

یان دووبارەکردنەوەی دەنگی (ی) هەشت جار لەم دێڕەدا:

**ژەهری دووری چەشتووە (هیجری) ئەمێستا بۆیەکە**

**تەڵخ گوفتارە ، کەلامی لەعلی شەککەر بارەکەم**

پێکهاتەیی شیعری

لێرەدا زیاتر باس لە خانەی فەرهەنگی وشە و چۆنیەتی ڕیزبوونی کەرەستەکانی ناو ڕستەکە، بەپێی شیعرەکە باس لەمانە دەکەین:

١) فەرهەنگی وشەکان

(کوردی) زمانەکانی (کوردی و عەرەبی و فارسی ) باش زانیوە، شارەزاییەکی باشیشی لە زمانی تورکی دا هەبووە، بەم زمانانە شیعری نووسیوە، بۆ ئەو کاتە زۆر ئاسایی بووە وشەی بێگانە لەناو شیعری شاعیراندا هەبێت، لەم شیعرەشدا دەبینین چەند جوان و شارەزا و کارامەییانە وشە بێگانەکانی ئاوێتەی وشەکانی دیکە کردووە، کە خوێنەر هەست بە ڕەقی و نەشازی وشە بێگانەکان ناکات، بەجۆرێک کورداندوویەتی لەناو یەکدا تواونەتەوە، بەو کۆمەڵە ئاوەڵناو و وەسفە جوانە یەک لەسەر یەکانەی خۆشەویستەکەی، دڵ و هەست و مێشکی خوێنەر دەخاتە جووڵە و نەشئە و خۆشییەکەوە، کە باس ناکرێت، ئەمەش بۆ وەستایی (کوردی) شتێکی ئاساییە، ئەی ئەوە نییە (حاجی قادر) بە شاسواری بەلاغەت وەسفی دەکات، بۆیە زۆر بەجوانی و ئازایانە لە مەیدانی فەساحەتدا ئەسپی خۆی تاو داوە. چەند جوان ئەم وشە عەرەبیانەی

چنیوە لە پاڵ وشە کوردییەکاندا (قاتیلە، جەللادده، عاشقکوژە، جەننات، تەحتەهالئەنهار، کەلامی، زاڵمە،......چەندین وشەی دیکە)

٢) ڕێژەی بەکارهێنانی ئاوەڵناو

ئەگەر سەرنجی شیعرەکە بدەین، ڕێژەی بەکارهێنانی ئاوەڵناو زۆر زیاتر و بەرزترە بە بەراورد لەگەڵ کار و ناو، ئەمەش شێواز و تایبەتمەندییەکی دیکەی (کوردی) یە لەم شیعرەدا، ئاوەڵناوەکان وەک (بێ مەیل، مەحبووب، عەییار، ئەسمەر، شیرین، نەوجوان، پەری، مەست، شۆخ، بەدبەخت، تەڵخ، غەددار.......)

٣) بەکارهێنانی جێناو

لەم شیعرەدا کە وەسفی خۆشەویست و ئازیزەکەی دەکات، دوو جێناوی بەکارهێناوە (ی ، م) جێناوی (م)کە بۆ شاعیر خۆی دەگەڕێتەوە، بۆ کەسی یەکەمی تاکە، وەک بڵێت خۆشەویستەکەم موڵکی خۆمە، هەر هی خۆمە، هەست بە موڵکداری خاوەندارێتی دەکەین (عەییارەکەم، غەددارەکەم، خونخوارەکەم،...) جێناوی (ی) کە بۆ کەسی سێیەمی تاکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستەکەی، لە چەند شوێنێکیشدا دەگەڕێتەوە بۆ (هیجری) ئەمەش نازناوی شاعیر خۆیەتی، واتە دەگەڕێتەوە بۆ شاعیر کە دەڵێت:

**ژەهری دووری چەشتووە (هیجری) ئەمێستا بۆیەکە**

**تەڵخ گوفتارە، کەلامی لەعلی شەککەر بارەکەم**

٤) ئامرازی جەختکردنەوە (هەر)

ئەگەر سەرنجی دێڕی شەشەم بدەین دەبینین، بۆ تاکیدکردن و جەختکردنەوە، شاعیر ئامرازی (هەر) ی بەکارهێناوە کە دەیەوێت بەوە پێی داگری و کۆڵنەدانی خۆی پیشان بدات، کە واز ناهێنێت و هەر دەچێت بۆ لای یارەکەی.

**گەر ڕەقیب صەد جار دەرم کا ، یا جنێوم پێ بدا**

**نا عیلاجم، هەر دەبێ بێم ، بۆ صیلاحی کارەکەم**

دەلالەتی شیعری

١) لێکچواندن: دوو وشە یان زیاتر بەهۆی بوونی سیفەتێ، یان چەند سیفەتێکی هاوبەش لە نێوانیاندا،بەیەک دەچوێنرێن، بەڵام کتومت وەک یەک نین، لێکچواندن لە چەند بنەڕەتێک پێک دێت (لێچوو، لەوچوو، ئامراز، ڕووی لێکچواندن).

ئەم شیعرە سەرتاپای لێکچواندنە، بەڵام تەنیا (لێچوو و لەوچوو)ی باس کردووە، ئامراز و ڕووی لێکچواندن نەهاتووە، ئەمەش یەکێکە لە جۆرە بەهێزەکانی لێکچواندن، کە بە (التشبیە البلیغ) ناودەبرێت، لێکچواندنی جەختاوی پوختە، بەهۆیەوە کۆمەڵێک وێنەی ناسک و جوانی دروستکردووە، لێرەدا زیاتر بایەخی بە ئاستی ئاسۆیی وشەکان داوە، بۆیە وێنەکان لە شێوەی لێکچواندندا دەردەکەون.

(گوڵ بەدەن، سیمین زەقەن، خەط یاسەمەن، فندق دەهەن، قەد عەرعەر، ئەبرۆکەمان، پەری ڕوخسار، تورک ڕەفتار،.....)

ئەم وێنە شیعرییە بەهێزانە تەنها بەهۆی لێچوو و لەوچووە دروست بووە،

بەدەنی وەکو گوڵ وایە ( گوڵابەدەن) ، بەدەن / لێچووە ، گوڵ / لەوچووە

قەد و باڵای بەرزە وەک داری عەرعەر ( قەد عەرعەر) قەد / لێچووە ، عەرعەر / لەوچووە

بەبێ ئەوەی ئامراز بهێنێت، یان باس لە ڕووی لێکچواندن بکات، ئەمەش خۆی لەخۆیدا کورتبڕییە،

٢) تیل نیشان

**لەیلەکەی،چاو مەستەکەی، دڵ بەستەکەی، نەوڕەستەکەم**

**حووریی (جەنناتو، تەجری تەحتەهالئەنهار)ەکەم**

ئەم دێڕە ئاماژەیە بۆ یەکێک لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە دەڵێت: (جنات تجری من تحتها الانهار) ئەمە دەچێتە خانەی جوانکاری واتاییەوە .

٣) ئاوێتەکردنی هەستەکان

واتە تێکەڵاوکردن و ئاوێتەکردنی هەستەکانی مرۆڤ وەک (بیستن، بینین، چەشتن، بۆنکردن، بەریەککەوتن) شاعیر دوو هەستی جیاواز، یان زیاتر ئاوێتەی یەک دەکات، کە شێوازێکی نوێ و وێنەیەکی جوان و مانایەکی بەهێز دەبەخشێت، تەڵخ گوفتار، دوو هەستی جیاواز هەستی چەشتن کە تاڵییە لەگەڵ هەستی بیستن کە گوفتارە ئاوێتەی یەکی کردوون شیرین زوبان، بەهەمان شێوە هەستی بیستن و چەشتنی تێکەڵاو کردووە .

کەلامی لەعلی شەککەر، هەستی بیستن و بینین و چەشتن ئاوێتەی یەکبوون.

ژەهری دووری، هەستی چەشتن و بابەت و شتێکی زەینی و مەعنەوی تێکەڵ کردووە.

لە کۆتاییدا دەڵێین وا دیارە (کوردی) لە دەرەوەی وڵات بووە، کاتێ ئەم شیعرەی نووسیوە بەوەی لە دێڕی کۆتاییدا نازناوی (هیجری) بەکارهێناوە لەجیاتی (کوردی)، کە ئەمەش شێواز و تایبەتمەندییەکی مستەفابەگ بووە جیاواز لە هاودەمەکانی، دوو نازناوی هەبوو، کە لە گەڕان و سەفەردا شیعری نووسیبێت نازناوی (هیجری) بۆ خۆی داناوە، بەومانایەی دوورە لە وڵات و ئازیزان ، ئەمە جگە لەوەی هەر لەو دێڕەدا باسی دووری و ناخۆشییەکانی دەکات.

# مستەفا بەگی کوردی لە فەرهەنگی هەڵکەوتوویی و دەرکەوتندا..



(دوو بەسەر کردنەوە)

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

(١)

چاوهەڵهێنانی ئیمارەتی بابان و گواستنەوەی کارگێڕی فەرمانڕەواییەکەیان لە قەڵاچوالانەوە بۆ ئەم جێگە شیاوەی شار و ناولێنانی بە سلێمانی و جاڕدانی بە پایتەختی نوێی ئیمارەتەکە، خەونێکی سەوزی بەدیهاتووی هەموو تاکێکی تینوو و بەئەمەکی کورد بوو، ئیتر بەرە بەرە قەبارەکەی بەرەو زیادبوون دەڕۆیشت و لە چەندان لاوە بنەماڵە و کەسایەتییە ئاینیی و بروگەیی و کۆمەڵایەتییەکان ڕوویان تێکرد. ئاوەدانی و گەشەکردنەکەی بووە جێ سەرنجی کورد، بەتایبەتی و هەردوو دەوڵەتی ئێرانی و تورکی عوسمانی بەگشتی. ئەوەندەی نەبرد هەردوو فێرگەی قادری بە ڕابەری شێخ مارفی نۆدێ و نەقشبەندی بە ڕابەری مەولانا خالید سەریان هەڵداو کەسانێکی زۆریان لە دەوری خۆیان کۆکردەوە. ئینجا سەرهەڵدانی دەیان زانای ئایینی و شاعیرانی خاوەن شوێنەواری بەهێز و جێدەست دیاری وەکو مەلا خدری شارەزووری (نالی) و ئەوڕەحمان بەگی ساحێبقران (سالم) و مستەفا بەگی ساحێبقران (کوردی) و مەلا وەسمانی دەرگەزێنی و هی تر. ئەو سیانەیان، واتە نالی و سالم و کوردی بەسێکوچکەی بابان ناسراون و دانراون.

بەداخەوە ئەگەرچی هیچیان تا ئەمڕۆ بەتەواوی، نە لەدایکبوون و مردنیان زانراوە، نە شوێنەواری شیعر و نووسینیان وەکو سەرجەم کۆکرابێتەوە. ئەمەیش هۆکاری بنەڕەتی خۆی هەیە، کە ئەم وڵاتی کوردەوارییە بەگشتی چەندە مەینەتبار و جێگە ئامانجی چاوتێبڕیوان بووە؟ لەململانێ و گۆڕەپانی هەروا بگرەو بەردە چەندە سەرگەردان بووە؟ ئەم هەویرە ئاو زۆر دەبات، کەشتی بۆچوونەکەمان لە زەریای قەڵەمێکی هەڵکشاوی ئەو سێکوچکەیەدا لەنگەر دەگرێ. مستەفا بەگی ساحێبقران وەک وتمان تائێستا بەڵگەیەکی زانیاری ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە، چ بۆ دیاریکردنی لەدایکبوون و مردنەکەی و چ بۆ چوونە ناو

کرۆک و چۆنێتی ژیاننامەیەوە، ئێمەیش لە سنووری ئەو سەرەتایانەوە پێهەڵدەگرین، ئەم بلیمەتە پێگەیشتووە لە گەرمەی لاوێتیدا ئەوین تەنگی پێ هەڵدەچنێ و وردەوردە لە تەنکاوییەوە بۆ قوڵایی دەڕوات و هەندێ دەڵێن پتر پەرۆشی ئەو دیوەکەی تری عەشق بووە. بەهەر حاڵ وەک دێوانەیەکی ئەو مەبەستە بەهێزەوە دێتە گۆڕەپان و دەستپێدەکات:

**کوللی عالەم وابوون سەرگەشتەو حەیرانی عەشق**
**هیچ کەسێ نازانێ ئەحواڵی سەرو سامانی عەشق** (١)

مستەفا بەگی ساحێبقڕان، یەکەم نازناوی (هیجری) بۆ خۆی و ناسینەوەی شیعرەکانی هەڵبژاردووە، چەندان غەزەلی بەو نازناوەوە وتـووە.. یەکەمین شاعیرێ کە هاوچەرخی بووبێت بەو نازناوە ناوی بردبێت صەیدی هەورامی بووە ١٧٩٩-١٢٢٦ک کە لە وەڵامی نامەیەکی شیعری مستەفا بەگدا دەڵێت:

**(هیجری) نەزانان، (هیجری) نەزانان**
**تۆ بەحاڵی دەرد ئێمەت نەزانان**
**من (صەیدی) سەردار سوپای دێوانان**
**کوشتەی دەردی عەشق زەدەی هیجرانان** (٢)

لە هەندێ سەرچاوەدا دەڵێن بۆیە ئەم نازناوی هیجرییەی بۆ خۆی دانـاوە، چونکە ئـاوارە و ماڵ بەکۆڵ بووە. وەک نازناوی (کوردی) یەکەمجار لەلایەن کەسی نزیک و ئامۆزای خۆیەوە سالمی ساحێبقڕانەوە لە غەزەلێکی دەستپێشکەریدا بۆ شێوەزاری بابان ناوی براوە:

**لە ڕۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر ڕوئیەتی مەعشوق**
**کەمەر بەستەی هونەر هاتن بەتیپی عەشق بازانا**
**لەلایەک (نالی) و (مەشوی)، لەلایە (سالم) و (کوردی)**
**لە هەنگامەی هونەر گەرمی تکاجۆ بوون بە (مەولانا)**
**لە مەیدانی بەلاغەتدا بە سواری مەرکەبی مەزموون**
**بە کوردی هەریەکە تازی سواری بوون لە بابانا** (٣)

حاجی قـادری کۆیی شاعیر و خەمخۆری دۆزی ڕەوای کوردی، لە چامە مەزن و بەناوبانگەکەیدا -شەهسواری بەلاغەتی کوردان- کە بەسەرکردنەوەی کۆمەڵێ شاعیری کوردەوارییە مەبەستی دەستپێکە بۆ شێوەزاری بابان هەر لەسەرەتاوە وا دەستپێدەکات:

**شەهسواری بەلاغەتی کوردان**
**یەککە تازی فەساحەتی بابان**
**مستەفایە تەخەللوسی -کوردی-**
**غەزەلی کردە بەربوتی کوردی**
**ناوی ساحێبقڕانی خاسی ئەوە**
**چونکە لەم عەرسە ئەسپی ئەو بەدەوە** (٤)

ئەم دانپیانەی حاجی قادر کە هاوچەرخی کوردی بووە بەهەند وەردەگیرێ و گەورەیی و بوێری مستەفا بەگ دەردەخـات کە لەو سەردەمە جەنجاڵەدا، جگە لەوە

کە شیعر بە کوردی بڵێت نازناوی (کـوردی) بۆ خۆی دەستنیشان بکات و زاراوە عەرەبییەکەی هیجری واز لێ بهێنێت. ڕەحمەتی گیوموکریانی دەیـوت مستەفا بەگ ئەوەی بەسە کە ئەم نازناوەی بۆ خۆی داناوە، کە وشەی پیرۆزی کوردییە، هەروەها شێخ ڕەزای تاڵەبانیش بەهەمان مەبەست کوردی لا گەورە و سەروەر بووە:

(جارێک لە شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەپرسن گەورەترین بوێژە کۆنەکانمان کێن؟ شێخ ڕەزا لەوەڵامدا وتی: ئەگەر هەموو هەستیارە کۆنەکانمان زیندوو بوونایەوە هەر یەکە ڕۆژی جارێک دیدەنیم دەکردن، بەڵام کوردی ڕۆژی پێنج جار) (٥)

ماوەتەوە بڵێین یەکەم شاعیرێ بۆ یەکەمجار شیعری (کـوردی) کردبێتە پێنجینە-تخمیس-و زۆر تیایدا سەرکەوتوو بێت، شێخ ڕەزای تاڵەبانییە، کە لە دوا کۆپلەیدا دەڵێت:



**بابا تاهیری هەمەدانی**

**نەماوە ڕەونەقی بازاڕی عەقڵ و دانیش و وردی**
**بەپوولێ نایکڕن لەم عەسرەدا عیلمی ئەبی وەردی**
**لە ئەشعاری (ڕەزا) پەیدایە ئاساری جەوانمەردی**
**(دوڕ و یاقووت دەبارێ لەم کەلامی شیرینی (کوردی)**
**خوا ساکوا لە دنیادا قەدرزانێ خەریداری) (٥)**

ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقڕان، شاعیری شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەر و پلە بەرز لە هونەری شیعریدا کە برازای مستەفا بەگی کوردی بووە. لە چوارینەیەکی پڕ لە وردەکاری و پەلهاوێژدا شکۆمەندی (کوردی)ی مامی لە دەستپێکی شیعردا دەردەخات، تا دەگات بەخۆی:
**خەرمانی لەفزی کوردی (کوردی) کە کردی پێوان**
**(نالی) کە نالّی کاسەیەکی دا بەویش لێوان**
**تاراجی کرد کە مەحوی ئەفەندی بە لوتفی خۆی**
**عوشریشی دا بە (حەمدی) وتی بیبەرە دیوان (٦)**

-تێگەیشتنی ڕاستی-یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە عێراق لە سەردەمی ئیحتیلالی بەریتانیا کۆمەڵێ ژمارەی بەکوردی لێ دەرچووە.

وتار و لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی تێدایە لەژێر ناونیشانی ئەدەبیاتی کورد و تەرجەمەی حاڵی کوردی. لەوە دەچێت نووسینی شاعیری پایە بڵند و کوردپەروەر شوکری فەزڵی بێت، یان پڕۆژەیەکی نووسینی هاوبەشی نێوان شوکری فەزڵی و مێجەرسۆن بێت. لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوەکە بەپێی ئەو ڕۆژە نەختێ دوور و درێژە، ئەوە هەڵدەگرێ کە سەربەخۆ بڵاوبکرێتەوە، بەڵام پەرەگرافی تەرجەمەی حاڵی کوردی وەک خۆی تۆمار دەکەینەوە.

(کوردی) مستەفا بەگ لە بەگزادەکانی سلێمانییە، تەئریخی ویلادەتی و وەفاتی نەنووسراوە. ئەمما وەکو لە ئاساری دەناسرێتەوە، لە ئەسنای ئیستیلای تورک ژیاوە، حەفتا هەشتا ساڵ لەمەوپێش حەیاتی شیعری دەستپێکردووە، ئەم شاعیرە وەکو نەقڵ دەکرێ عاشقێکی پاک بووە و مەحبووبێکی حەزلێکردووە، کە ئەمەندە جوان نەبووە-، لەپاش مودەتێ مەحەبەت تەئسیری تێدەکا و وەکو مەجنون دەکەوێتە دەشت و کێوی کوردستان، لە ئەترافی سنە و سابڵاخ چەند ساڵ ڕووت و پەرێشان دەگەڕێ. وە دائیمەن شیعر دەخوێنێتەوە بەعزێ خەڵق لێیان دەبیست و دەیان نووسییەوە، شیعری زۆری گوم بووە. لە زەمانی جۆششی مەحەبەت تەماشاکەن چی ئەڵێ:
**ئەم سەرە بۆچی دائیم پڕ لە عەشقی یار نەبێ**
**ئەم دڵە بۆچی دائیم وا لەوو غەمبار نەبێ**
**هەر کەسێ بێت و بڵێ من عاشقم باوەڕمەکە**
**تا لەسەر گۆنەی نیشانەی جێگە گەستەی مارنەبێ**

ئەم دوو بەیتە پەرێشانی مەحەبەتی ئەم شاعیرە چەند ساف و ڕاست بەیان دەکا، ئەوەی بیان خوێنێتەوە ئیتر ئیحتیاج ناکا. بۆ تەرجەی حاڵی کوردی بکرێ.(٧) ئەمین


کوردی



فەیزی بەگ لە کتێبی-ئەنجومەنی ئەدیبان-دا بەدرێژیک لەگەڵ سالمدا ئاماژەیان بۆ دەکات: (هیجری و کوردی) و (سالم) ئەهلی سلێمانین.
شیعریان پڕ تەراوەت و عاشقانەیە..(٨) لەگەڵ ئەوەشدا چەند غەزەلێکی کوردی تێدا بڵاوکردۆتەوە کە بۆ ئەو ڕۆژگارە گرنگ بووە، ئەوەی ئەهلی قەڵەم بوو بێت کوردی بناسێت و دڵبەندی شیعرەکانی ببێت، ئەگەرچی لەم کێومالەدا ئەم وردە سەرچاوانەمان بەرچاو کەوت، لەوە دەچێ کوردی لە فەرهەنگی شیعری شاعیرانی هاوچەرخی و دوای خۆی ناوی برابێ و ڕەنگدانەوەی شیعرەکانی بەهەند وەرگیرابێ. بەڵام چی لە نەهاتی ئەم گەلە ژێر دەستە داپلۆسراوە دەکەیت کە سەدان شوێنەواری بایەخداری ئەدەبیی و مێژوویی و هونەریی ونبووە، یان بۆتە ئامانجی سووتاندن و ڕزین، ئەوە ماوە بڵێین مستەفا بەگی کوردی لەپێش بیستەکانەوە ناو بەناو لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا تاساڵی ١٩٣٠ ناوبەناو شیعرەکانی بەرچاو دەکەون، لە ساڵی ١٩٣١ لەلایەن هەردوو دڵسۆزی ئەدەبی گەلەکەمان، خوالێخۆشبوان (کوردی و مەریوانی)یەوە دیوانەکەی لەبەغدا بەچاپ گەیەنرا. لە کتێبخانەی هەژاری کوردەوارییدا کەلێنێکی پڕ کردەوە. لەلایەن گەورە ئەدیب و ڕووناکبیر و شاعیرانی ئەو سەردەمەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکرا، بگرە زۆربەی ئەو چەپکە شیعرەی تەخمیس کران.. لەدوای ئەو چاپەوە، ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ ڕازاندنەوەی لاپەڕەکانیان باوەشیان بۆ بەیت و غەزەلی کردەوە، لە مێژووی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلادین سەجادیدا، لێکۆڵینەوەی دروست و شیاوی بەباڵادا بڕاوە (٩)، لەدوای ئەمانەشەوە لە لێکۆڵینەوەکان و باخچەی شاعیراندا، دەیان جار لەسەری نووسراوە. ئەمە جگە لەو هەموو کەشکۆڵانەی دەیان ساڵ لەمەوبەر لەلایەن عاشقانی ئەدەبەوە کەوانەیەکی بەرفراوان بەخەتی شکستەی فارسی شیعرە کوردیەکانی تۆمارکراون.

**(٢)**

**تێڕوانین و خوێندنەوەیەک**

**ئەمان مردم عیلاجێ**

بابا تاهیری هەمەدانی دەڵێت:

**هەر کەس عاشق بێ لە گیان ناترسێ**
**عاشق لە جەور و زیندان ناترسێ**
**دڵ عاشق بۆتە گورگێکی برسی**
**کە گورگ لەهی هیی شوان ناترسێ**(١٠)

مستەفا بەگی ساحێبقران-کوردی- شاعیری سەردەمی ئیمارەتی بابان لە سلێمانی، هەڵگری پێناسەی عەشقی پاک و بێگەردە.


شێخ ڕەزای تاڵەبانی

لە دیوانە نایابەکەیدا غەزەلێکی تەڕ و پاراوی هاوار لێ هەستاوی تەواوە لە بۆتەی عەشقدا، بەپێی دیوان و ئەو پێنج خشتەکیانەی لەسەری کراوە، بریتییە لەم هەشت بەیتەی لای خوارەوە:

**ئەمان مردم عیلاجێ سا لەڕێی پێغەمبەرا چارێ**
**ویصاڵ یا قەتل یا تەسکین لەهەرسێ بۆم بکەن کارێ**
**وەها سووتاوم ئەصلا تابی فەریادم نەما سا دەی**
**ڕەفیقان نیوە سووتن ئێوە نامەرد عەرزە هاوارێ**
**لە کونجی سینە دەنگی ئای و ئۆی دڵ دێ بە مەحزوونی**
**وێران بێ نەم دی ساتێ لێی نەیێ ناڵەی برینداری**
**لای هەر کەس ئەچم مەنعم ئەکا خۆت بۆچی ڕیسوا کرد؟**
**درێغ کوا حاڵ زانێ ڕەببی تووشم بێنی بیمارێ**
**لەژێر باری غەما وا شانی سەبرم ڕێشە ئێستاکە..**
**فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕی لێم بۆتە سەرباری**
**سەبا یارانی مەجلیس گەر هەوڵی من ئەپرسن لێت**
**بڵێ کێشایە مەیخانە دوو چاوی بێچووە عەییارێ**
**لە نەزعا پێی ئەڵێم قوربان جەفا بەس بێ ئەڵێ کافر**
**چماچەت دیگە تۆ سەگ مەرگی کارم ماگە پێت جارێ**
**دوڕ و یاقووت ئەبارێ لەم کەلامە شیرنەی کوردی**
**خوا سا کوا لە دنیادا قەدر زانێ و خریدارێ**

*　*　*　*

تێکڕای بەیتەکان لەسەر وەزنی عەرووزی عەرەبی داڕێژراوە. دەنگدانەوەی ئەم غەزەلە بایەخدارە لە ناوەندی عارفان و خوێندەواراندا، لە ناوەندی شاعیران و شەیدایاندا کەم وێنەبوو.

هەر بۆیە تازە بە تازە دەست شێخ ڕەزای تاڵەبانی کەوتووە، ئەویش ئەوەندە دڵبەندی بووە یەکسەر بۆ پتر ڕازانەوەی شیعرەکە، کردوویە بە پێنج خشتەکی، تیایدا توانا و وەستایی و بەهرەداری خۆی تێهەڵکێش کردووە.. لەوەدوا لەلایەن شاعیرانی دیکەوە جگە لە پێنجینەکردنی غەزەلەکانی تری بە گشتی، هاتوون ئەم غەزەلەیان بە تایبەتی برەوپێداوە، ئیتر وەک لاساییەکی شێخ ڕەزا بێت یان خۆتاقیکردنەوە بێت، لەوانە: حەمدی و عارف عورفی، بێکەس، ئەخۆل، عەبدوڵڵا بەسۆز، ڕازی..تاد، تەنانەت مامۆستا ع.بەسۆز چوارجار بە چوار داڕشتنی جیاجیا ئەم غەزەلەی کوردیی کردووە بە پێنج خشتەکی، ئەو دەیوت لە ڕاستیدا (ئەمان مردم) نییە، بەڵکو (ئەمان مەردم)ە، چونکە فیغانەکەی بۆ کەسەکانە.



**نالی - سالم - کوردی**
**پەیکەری سێ کوچکەی شیعری بابان- بەردەم کتێبخانەی گشتی سلێمانی- پەیکەرساز بەرزان زاهیر**

هەندێ لە شیعرەکانی کوردی لەلایەن گۆرانیبێژانی کوردەوە کراون بەگۆرانی و مەقام (١١). بەهەرحاڵ ئەم غەزەلەی کوردی لە هەموو غەزەلەکانی تری بەناوبانگ ترە و گرنگی پێدراوە.

خوێندنەوەیەکی بەیتەکانی ئەم غەزەلە: یەکەم بەیت: کوردی لەسەر سفرەی عەشق بە بڵێسەی بۆچوونێکی سەرنجراکێش و میللییەوە ڕوودەکاتە هاوڕێیانی دەوروبەری، بە نرکەیەکی بێ وێنەوە پێیان دەڵێ: ئەگەر مسوڵمانن لە ڕێی پێغەمبەردا بێن بەدەنگمەوە.کار بۆ ئەنجامدانی ئەم سێ وشەیە بکەن لەگەڵما کە ویسال، یا قەتل، یا تەسکین، واتە یان بمگەیەنن بە ئەوێندارەکەم، یان خوێنم پێتان حەڵاڵ بێ بمکوژن، یا دەستوبردێ بکەن لەم تەنگانەیە دەربازمکەن:

**ئەمان مردم عیلاجێ سا لەڕێی پێغەمبەرا چارێ.**
**ویسال، یا قەتل، یا تەسکین لە هەرسێ بۆم بکەن کارێ**

دووەم بەیت/ لە ڕاستیدا، کە ئەم خورپەیەم پێکەوتووە وگڵۆڵەی کردووم لە ئەنجامی ئەو هەڵپرۆکاندن و سووتانە کاریگەرەیە کە پەلوپۆی شکاندووم و گوڕی لێبڕیوم، لەوانەیە بڵێن ئێوەی عاشقیش وەهامان بەسەر هاتووە، نەخێر وانییە، بەڵکو ئێوە بە نیوەی من گیرۆدەن نامەردینە لەئاست ئەم سکاڵایەم بۆ بێدەنگن، هەر خرۆکەی زەوی ماوە پەنا و هاواری بۆ بەرم.. ئەگینا کوانێ لەئێوە ئەم حاڵەتە نامۆیەی بەسەردا هاتبێ؟

**وەها سووتاوم ئەسڵا تابی فەریادم نەما سادەی**
**ڕەفیقان نیوە سووتن ئێوە نامەرد عەرزە هاوارێ**

سێیەم بەیت/ وەرن سەیری لاپەڕە پڕ ئێش و تەماوییەکانی ناو سنگم بکەن، گوێ لە کۆئەندامی دڵ بگرن تیایدا، دەنگی ئای و ئۆی لێوە دێت، بەڵام بەناسۆری و کسپە و داماوییەوە، ئەمە بەشێکە لەباری گرانی ژیانم، وێران بێ ئەم کونجی سینەیە کە مۆڵگەی پەژارەیە. هەر دەمە گوێ بیستی ئاهونالەی بریندارێکی لێ ڕەچاو دەکەی:

**لە کونجی سینە دەنگی ئای و ئۆی دڵ دێ بە مەحزوونی**
**وێران بێ ئەم دی ساتێ لێی نەیێ ناڵەی بریندارێ.**

چوارەم بەیت/ ئەمڕۆ هەموو کەسێ لە زەمانی نهێنی عەشق و ئەوینی گەرم و بێگەرد تێناگا، چبکەم؟ پەنا بۆ هەر کەسێک دەبەم ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ سەرکۆنەم دەکاو دالدەم نادا، پتر بەخۆمدا دەمشکێنێتەوە و پێم دەڵێ: ژیان ئەوە دەهێنێ بەم چەشنە خۆت ڕیسوا و شپرزە کردووە. ئەی کەسێک بەم هەموو ئازارەوە بتلێتەوە، چۆن دەتوانێ درێژە بە ژیان بدات، ئاخر کوا حەکیم و حاڵزانێ بمگرێتە خۆی. خودایە کە فریادڕەس نەبێ برینەکەم قووڵتر بکە، تا تەفروتوونا دەبم، بەداخەوە:

**بەلای هەرکەس ئەچم مەنعم ئەکا خۆت بۆچی ڕیسوا کرد**
درێغ کوا حاڵ زانێ ڕەببی تووشم بێنی بیمارێ

پێنجەم بەیت/ مخابن ڕۆژگـار ئەمەندە دڵـڕەق بوو لەگەڵما، کەس گوێی نەدا بە داخوازی و پێشنیازەکانم. بۆیە بە تاسەیەکی بەرچاوەوە لەژێر باری قورسی خەمی بێئاماندا شانی سەبرم زامدار و ماندووە.. ئەمە هەمووی بۆ ئەوەی کە یاری شۆخ و شەنگم لێم جودایە کە بۆ من بۆتە سەرباری ئاخر شەڕی و سوێبوونەوە:

**لە ژێر باری غەما وا شانی سەبرم ڕێشە ئێستاکە**
**فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕی لێم بۆتە سەربارێ**

شەشەم بەیت/ دوای ئـەو هەموو کێشە دەروونـی و پەرێشانی و نائومێدییە ڕوودەکـاتـە سەبا، بای خۆرهەڵات، بای هەناسە گەیێن، ڕاسپێری ئەوەی لا دەکا ئەگەر هات و دۆست و ناسیاوان، یان ئەهلی عەشق پرسیاریان لەبارەی دیارنەبوونی منەوە لێت کرد، بەیەک بەیەکیان بڵێ بۆیە ئێرەو لای ئێوەی بەجهێشتووە، چونکە دولبەرێکی عەیار بەچاوەکانی بەرەو مەیخانە کێشیکردووە:

**سەبا یارانی مەجلیس گەر هەوائی من ئەپرسن لێت**
**بڵێ کێشایە مەیخانە دووچاوی بێچووە عەییارێ**

حەوتەم بەیت/ گرفتاربوونی کوردی سنوور دەبەزێنێ ئەوەتا، تەنانەت لەکاتی گیانەڵایشدا تکای لێدەکات وشەی سۆزداری وەکو (قوربان) لە ڕوویدا بەکاردێنێ کە ئیتر چەوسانەوە و گرژی و بێ ویژدانی بەسە. لە وەڵامدا پێی دەڵێت: هێشتا چیت دیوە ئەی خوانەناس تۆ سەگ مەرگی و بەرگە دەگری و کاری ترم پێت ماوە کە لەوانەی پێشوو سەختترن چاوەڕوان بە:

**لەنەزعا پێی ئەڵێم قوربان جەفا بەس بێ ئەڵێ کافر**
**چما دیگە تۆ سەگ مەرگی کارم ماگە پێت جارێ**

هەشتەم بەیت/ مستەفا بەگی کـوردی لـەدوا بەیتا باڵادەستی و شارەزایی خۆی لە بواری شیعری کوردیدا بەیان دەکات کە وتە و وشەی ئەمەندە بەجێن، ئەگەر بێت ببن بەباران لەگەڵ تکەکانیدا دوڕ ویاقووت و مـرواری دەبـارێ.. خۆزگە ئەهلی ئەدەب و هونەر لە نرخی بەیتەکانی بە تەواوی تێدەگەیشتن و دەبوونە کڕیاری و نرخی خۆیان پێدەدا: (١٢)

**دوڕ و یاقووت ئەبارێ لەم کەلامە شیرنەی کوردی**
**خودا ساکوا لە دنیادا قەدرزانێ، خریدارێ**

لە کلاورۆژنەی ئەم غەزەلەوە پلەکانی جۆش و پەرۆشی مستەفا بەگی ساحێبقرانمان بۆ دەردەکەوێ کە پێش قەیسی عامیری و فەرهادی کۆهکەن و کاکە مەم و وامیقی..تاد داوەتەوە. هەر ئەم هەڵوێست و سەوداسەری و دێوانەییەی بووە، کە لەهەر دوو بەشی کوردستانی

باشوور و ڕۆژهەڵاتدا پێگەی بەرزی ئەدەبیاتی بگاتە ئاستی شاعیرە هەرە ناودارەکانی ئێران و سەردەمەکەی خۆی و حیسابی تایبەتی بۆ بکرێ.

**سەرچاوە و پەراوێز:**

(١) دیوانی کوردی-مستەفا بەگی ساحێبقران-چاپی سێیەمین، چاپخانەی کوردستان-هەولێر ١٩٧٣، لاپەڕە: ٣٣

(٢) دیوانی صەیدی، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی محەمەد ئەمین کاردۆخی چاپخانەی کامەران-سلێمانی ١٩٧١ لاپەڕە: (٢٠٥).

(٣) بەشێک لە دیوانی سالم - ساغکردنەوەی کاروان عوسمان خەیات -ڕێبین-پێداچوونەوە و پێشەکی دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین، سلێمانی چاپخانەی چوارچرا ٢٠١٢ بڕوانە لاپەڕە ٧٨.

(٤) دیوانی حاجی قادری کۆیی- لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا-انتشارات کردستان سنە ساڵی ١٩٣٠ (لەبەرگرتنەوەی چاپی هەشتاکانی کوردستانی عێراق) لاپەڕە: ٢١٧ (حاجی قادر (کوردی) ناسێکی بەویژدان بووە).

(٥) دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی-ساغکردنەوە و شەرحی شکور مستەفا چاپی هەولێر، چاپی دووەم ٢٠١٠ لاپەڕە: ١٤١.

(٦) دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ-ساحێبقران - لە بڵاوکراوەکانی نامەخانەی گەلاوێژ -سلێمانی -چاپخانەی ئەسعەد -بەغدا ١٩٥٧ لاپەڕە: ٥، ١٣٧.

(٧) ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی (١٩١٨-١٩١٩) یەکەمین ڕۆژنامەی کورد لە عێراق-ئامادەکردنی ڕەفیقساڵح و سدیق ساڵح، چاپی هەولێر و لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین ساڵی ٢٠٠٧، بڕوانە لاپەڕەکانی ٤٨، ٤٩، ٥٢، ٥٣.. تێبینی: هەندێ جیاوازی لە دەقی شیعرەکاندا هەیە ئێمە وەکو ئەمانەتی ئەدەبی وەکو خۆیان نووسیومانەتەوە. بەلای بەندەوە کوردیرەوانی لەم ڕۆژنامەیەوە دەستپێکردووە. ئەمەیش جێگەی دەستخۆشییە بۆ نووسەران و ئامادەکارانی.

(٨) ئەنجومەنی ئەدیبان-بسم الله الرحمن الرحیم-سیدق و سەلامەت.

عیلم یەقین و حەیاتی سەرمەد خەوفی خودایە حوبی محەمەد

تەئلیفی ئەمین فەیزی بەگ

چاپخانەی تەرجومانی حەقیقەت-ئەستەمبوڵ ١٣٣٩ (١٩٢٠).

تێبینی: وەک دەق ئەمە یەکەم کتێبی ڕوونکردنەوە و ناساندنی کۆمەڵێک شاعیری کوردە. بریا وەک خۆی چاپ و لەبەری دەگیرایەوە.

(٩) مێژووی ئەدەبی کوردی-نووسینی مامۆستا عەلادین سەجادی، چاپی ئێران ١٣٩١ بڕوانە لاپەڕەکانی ٣٢١ تا ٣٣٤.

(١٠) گەنجینە- بەشێک لەچوارینەکانی بابا تاهیری هەمەدانی دڵزار کردوویە بەسۆرانی- لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی (ئازاد) چاپخانەی-الوفا - بەغدا ١٩٦٠ بڕوانە لاپەڕە (٧٦).

(١١) ئەم غەزەلەی کوردی لەلایەن دەنگخۆشی گەورەی کوردستان مامۆستا تاهیر تۆفیق کراوە بە مەقامێکی ئارام بەخش.

(١٢) ئەم عەزەلە لە دیوانی کوردیدا هەشت بەیتە، بەڵام لە دیوانە کوردییە نوێیەکەی مامۆستا حەمە بۆردا نۆ بەیتە، واتە ئەم بەیتەش هی کوردی بووە کاتی خۆی دەست نەکەوتووە بخرێتە ناو دەق و دیوانەکەیەوە:

((بەڵای (مەنسوور) لە دڵمی داو مەدەد کاری نەبوو تالیع

لە دەرگای یار وەکو شێت-بازی بردو کەوتە سەر دارێ))

نۆیەم بەیت/ واتە چارەنووسم وەکو مەنسووری حەللاجی بەسەرهات، کە لە پێناوی (انا الحق)دا، کە ڕاستی و ڕاستگۆیی دەگەیەنێ، لای نەدا، منیش وەک شوێنکەوتەیەک ئەسپی خۆم تاودا، بەخت یارم نەبوو، بازی دڵم فڕییە سەر دارێ ئەو دارەی بۆ سێدارە لەئارادا بوو بەچەشنی حەللاج، سەرم نایەوە.. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ هەر کەسێک لەپێناوی ئەوینی بێگەرد و ڕاستی دا تیابچێ، ناو و ناوبانگی پیرۆز و مەزنی بۆ هەمیشە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

تێبینی: ئەوەی ماوە دەربارەی ئەم غەزەلە ئاگرینە بیڵێین کە هەندێ لە شاعیرە ناودارەکان (٧) بەیت، یان (٦)بەیت، یان هەیە هەر (٨) بەیتەکەی تەخمیس کردووە، جگە لەوەش پاش و پێش و ئاڵوگۆڕی هەندێ وشە لە ئارادایە، ئەمەیش پێویستی بە ساغکردنەوە و بەسەرداچوونەوەیەکی پڕ لە وردەکاری دەوێت، شادبێت گیانی مستەفا بەگی کوردی، شادبێت گیانی ئەوانەی ڕێچکەی شیعرەکانیان گرتووە، یان تەخمیسیان کردووە، یان لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کردووە، یان لە تەقەلادان بۆ دۆزینەوەی شوێنەوار و زانیاری پوخت دەربارەی ئەم (شاسواری بەلاغەتی کوردان)ە.





# که‌شکۆڵستان و شاعیرانی کورد

**کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)**



مامۆستا هێمن موکریانی لە سەرەتای (لە کوێوە بۆ کوێ)کەیدا دەڵێت: (من بۆ خۆم وام، ڕەنگە زۆر کەسیش وابێ، کە شیعری شاعیرێک، یا نووسراوەی نووسەرێک دەخوێنمەوە "چ زیندوو، چ مردوو" پێم خۆشە خۆشی بناسم. بزانم کێیە؟ خەڵکی کام وڵاتە؟ کاری چییە؟ چۆن دەژی و ئەگەر مردووە چۆن مردووە؟ لە کوێ نێژراوە؟

منیش وەکو مامۆستا بیر دەکەمەوە، بەڵام یەک دوو وتەی زیاترم هەیە بۆ سەر قسەکانی مامۆستا هێمن موکریانی، ئەویش ئەوەیە کە کاتێک گوێم لە شیعرێک یان نووسراوەی نووسەرێک دەبێت، حەز دەکەم بزانم بۆ چ مەبەست و کاتێک نووسراوە، هۆکارەکەی چییە؟

هاوڕێیان کاتێک گۆش دەدەمە مەقامێکی کوردی، ئارەزوومە بزانم شیعری کێیە، یان کاتێک شیعرێکی کلاسیکی کوردی، یان نامەیەک دەخوێنمەوە، دەمەوێ بزانم چ ساڵێک نووسراوە و بۆچی وتراوە، هۆکاری نووسینی ئەم نامەیە چییە؟ نهێنی نێو نامەکە چییە...؟!

لەوەتەی دەستم داوەتە نووسین و ئارەزووی کۆکردنەوەی بەرهەمی شاعیرانی کوردم لەلا گەڵاڵە بووە و هەرچی کەشکۆڵم دیوە و گرد و کۆم کردوونەتەوە، هەرچی نامەی شیعری تێدا بووە لە هەر دەرفەت و کاتێکدا بووبێت، لێیانم بڵاوکردووەتەوە.

هەر لەو کاتەوەی کە دەستم داوەتە کەشکۆڵ کۆکردنەوە، بیریشم لەوە کردووەتەوە کە دەبێ شیعرەکانی (نالی، سالم، کوردی) کۆ بکرێنەوە، لەو نێوەندەشدا هەندێک شیعری باشی ئەم سێ شاعیرەم دەستکەوتووە، بەتایبەتی دوو دەستنووسی دیوانی نالی کە لەسەر شێوەی حرووفی ئەبجەدی نووسراونەتەوە، هەروەها دوو دەستنووسی دیکەی دیوانی (سالم)یشم دەستکەوتووە و هەموویانم

بڵاوکردەوە، دوابەدوای ئەمەش دەستنووسێکی تری دیوانی سالممم بە فارسی دەستکەوتووە، بەڵام تاکو ئێستا ئەوەمان بۆ ساغ نەبووەتەوە کە کام (سالم)ە؟!

جگە لەم دوانەی سەرەوە کە باسم کردن، بەشێک لە شیعرەکانی کوردیشم دەستکەوتووە، بەڵام ئەوەندەیە کە بەشی دیوانێکی بچووکی کوردییە و تەنها یەک پارچە شیعری نەبێت کە بڵاونەکراوەتەوە، ئەوانی دیکەی بڵاو بوونەتەوە...

یەکێک لەو دەستنووسانەی کە دەستم کەوتووە و جێگەی بایەخ پێدانە و پێویستە کاری لە سەر بکرێت، کەشکۆڵی (یەحیا)یە، ئەم کەشکۆڵە لە ساڵانی ١٨٩٩-١٩٠٠ی زایینی نووسراوەتەوە، کەشکۆڵەکە لە چوار بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمیان دوانی (نالی)یە، بەشی دووەمیان دیوانی مەولەوییە، بەشی سێیەمیان بریتییە لە شیعرەکانی سەلیم و لەسەر ڕیزبەندی حرووفی ئەبجەدی نووسراوەتەوە، بەڵام نازانرێ ئەم سەلیمە کێیە کە دیوانێکی پوختی بە زمانی فارسی نووسیوەتەوە، هەروەها بەشی چوارەم و کۆتایی ئەم کەشکۆڵە بریتییە لە شیعری نزیک بە ٣١ شاعیری کورد و فارس بە زمانی جیاواز، واتە: شیعری شاعیرانی کوردی تێدایە بە زمانی عەرەبی و کوردی و فارسی...

بەشێک لە شیعرەکانی ناو ئەم کەشکۆڵە هۆنراوەی (موستەفا بەگی کوردی) تێدایە، یەکێک لەو هۆنراوانە لە نێو دیوانەکەدا زۆر گەڕام، بەڵام نەم دۆزییەوە، بۆیە دەڵێم تاکو ئێستا بڵاو نەکراوەتەوە، لێرەدا بەپێویستی دەزانم بڵاوی بکەمەوە:

**شەماڵ جارێ بڵێ بەو سوخمە ئاڵەی یارە مەخموورە**
**بە حوسنی عاریزی خۆی حەیفە وا بێباک و مەغروورە**
**ئەمن بۆ فیرەتی ئەو ڕۆژ و شەو دایم دەناڵێنم**
**لە دووری من هەمیشە ئەو کە خۆشخەندان و مەسروورە**
**لە شادی دوورم و دوشمن لەگەڵ غەم، یار و دەمسازم**
**هەتا ئەو یارە دڵ ئازار و چاو بەخومارە لێم دوورە**
**بە عەکسی شمشێری ڕووخساری، لە بەرقی تینی ئاڵی**
**دەسووتێ دەیری عابید، دەڵقی زاهید سەر مەستوورە**
**هوجوومی قەولی سەری دڵ، نیگاهی سەنگی دەورانی**
**دەڵێ هێرشی ئەسری گاور دەبات، بەدەر مەنسوورە**
**کە سۆفاری برۆی خەم کرد و هێنای تا بیناگۆشی**
**موشەخەس تیری موژگانی بەقەتڵی ئێمە مەئموورە**
**عەبەس ئیزهارە بێ ڕەحمی نیگار، ئەزەلت عیشقە**
**کە ئەو دەستانە وەک دەستانی (کوردی) فاش مەنشوورە**

هیوادارم بە هەڵەدا نەچووبم لەم شیعرەدا، ئەگەر بڵاوکرابێتەوە، ئەوا داوای لێبوردن لە خوێنەران دەکەم، ئەگەریش بڵاونەبووبێتەوە، ئومێدەوارم ڕۆژێک بێت لە دیوانە جوانەکەی موستەفا بەگی کوردیدا جێگەی بێتەوە، دوابەدوای کەشکۆڵی یەحیا، لەلای دۆستی خۆشەویستم مامۆستا موحەممەد ڕەشیدی ئەمینی پاوەیی، کەشکۆڵێکی دیکەم دەستکەوت کە ئەویش چەند پارچە شیعرێکی نالی و سالم و کوردی تێدا بوون، لەوانە ئەو نامە شیعرییە بوو کە بۆ حەسرەتی نووسیوە و حەسرەتیش وەڵامی داوەتەوە... دواتر سالمیش بە پارچە هۆنراوەیەکی جوان وەڵامی کوردی و حەسرەتی داوەتەوە...

لەم بابەتەدا جگە لەوەی دەمویست شیعرە بڵاونەکراوەکەی کوردی بڵاوبکەمەوە و ناوی ئەم بابەتەشم بەناوی کەشکۆڵستانەوە ناوناوە، چونکە لە سەفەردا بووم و سەرچاوەی پێویستم





دەستنوسی کەشکۆڵی شیعری (کوردی)

لەبەردەستدا نەبوون تاکو بابەتێکی پوخت لەسەر کوردی بنووسم، هەر بۆیە ئەوەندەی کە سەرچاوەی پێویست بووبێت و بۆم هەڵگیرابێت لە کەشکۆڵەکەمدا، لەگەڵ خۆم بردوومە و ئەم بابەتەم پێ دەوڵەمەند کردووە.. لەم بابەتەدا کە نێوی نراوە کەشکۆڵستان، دەمەوێ لە پەیوەندی نێوان ئەم دوو ئامۆزایەدا هەندێ نهێنی ناو نامە شیعرییەکانیان بە سەرەقەڵەمێک بخەمە ڕوو...

ئاشکرا و ڕوونە لەلای نووسەران و ئەدیبانی کورد کە سالمی ساحێبقڕان و موستەفا بەگی کوردی ئامۆزای یەکتر بوون... بەڵام تا دەرکەوتن و چاپکردنی دیوانی کوردی لە لایەن مامۆستا حەمە بۆری خۆشەویستەوە، من پێم نەزانیوە کە نامەی شیعری لە نێوان ئەم دوو ئامۆزایەدا هەبووە، جگە لەوەش کە شیعرەکانی سالمم بە چاپ گەیاند، لەنێو ئەو دوو کەشکۆڵەی بەردەستمدا هیچ ئاماژەیەک بۆ ئەوە نەکرابوو، بۆیە لێرەدا هەندێک لە سەرباسی نامە شیعرییەکانی کوردی و سالم دەخەمە ڕوو، جگە لەوەش دەبێ باس لە شاری تاران بکەین کە سالم لە شاری تاران بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لێرەدا باس باسی کوردییە، تەنها بە ئاماژەیەکی کەم باسی دەکەم، بە یارمەتی خوای گەورە لە بابەتێکی تایبەتی دا باسی تارانەکەی سالم و کوردی و ئەڵماس خانی کەنووڵەیی دەخەمە ڕوو.

کوردی لە نامەیەکی شیعریدا بۆ سالم دەڵێت:

**ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم؟ غەریبی کۆیی دولبەر بم،**
**وە گەر ساتێ لە یادم چی؟ هیلاکی ژەهری ئەژدەر بم**
**بە غەیرەز، بۆسەیی چاوت، ئەگەر (قەسد)ی (ویسال)ت کەم**
**بە شوعلەی قەهری تۆ!! یا ڕەب سەراپا میسلی ئەخگەر بم**

(د. کو. ب ١، لا ٢٩٤)

سالمیش بە پارچە هۆنراوەیەکی جوان لە دوورە وڵاتەوە دەڵێت:

**تەریقی عەشقت ئەر ون کەم، تەریقی دەشتی مەحشەر بم،**
**قیامەت، نامەوێ جەننەت، بەبێ تۆ، گەر موخەییەر بم**
**هەناسەی سەردی پڕ سۆزم، بەیادت گەر لە دڵ ببڕێ،**
**لە سۆزی فیرقەتا، یارەب!! سەراپا: میسلی ئەخگەر بم.**

ئەگەر تەماشای ئەم وێنە شیعرییە بکەین لەلای هەردوو شاعیر، لەم نامە شیعرییەدا، دەبینین چەند وێنەیەکی جوانە، بەڵام وێنەیەکی دووبارە لە قاڵبێکی کوردانە و دۆستانەی ئامۆزایانەدا...

کوردی مەیلی سالم لە دڵ دەرناکات، سالمیش ڕێگەی عەشقی ئەو ئامۆزا خۆشەویستەی ون ناکات.. بەڵام ئەگەر کوردی ونی بکات ئەوا دەڵێت: غەریبی کۆیی دولبەر بم، سالمیش دەڵێت: ئەگەر ونی بکەم، ئەوا تەریقی دەشتی مەحشەر بم...

سەعدی شیرازیش دەڵێت:

**بی تو گر در جنتم ناخوش هوای سلسبیل**
**با تو گر در دوزخم خرم هوای زمهریر**

سەعدی شیرازی دەڵێت: ئەگەر بێ تۆ بمخەنە نێو جەننەتەوە ئەوا بۆ من ناخۆشە هەوای سەلسەبیل، بەڵام ئەگەر لەگەڵ تۆدا بمخەنە دۆزەخەوە، ئەوا لەلای من هەوای زەمهەریری گەرمی دۆزەخ خۆشترە لە هەوای سەلسەبیل کە لە بەهەشتدا بەبێ تۆ لێم دەدات..

قانعی شاعیریش دەڵێت:

**ئەگەر مردم وەتەن لاوانی تۆ خۆش**
**ئەگەر هیتلەر نەما، گاوانی تۆ خۆش**
**موخەیەر بم لە بەینی تۆ و بەهەشتا**
**لە جەننەت دووربم، سەیرانی تۆ خۆش**

(د. قانع، لا ١٣٦)

هەروەها کوردی لە بەیتێکی کەیدا دەڵێت:

**گەر موخەیەر بم لە نێوانی بەهەشت و وەسڵی یار**
**وە سڵی تۆ بۆ من، جەهەننم پڕ لە جەننەت نامەوێ**

(د. کوردی چاپی کۆن. لا ٨٨)

میهری شاعیریش دەڵێت:

**ئەگەر بێت و موخەیەر بم لە بەینی وەسڵت و جەننەت**
**ویساڵی تۆ لە بۆ من بێ، ئەبەد قەد نامەوێ جەننەت**

(د. میهری. لا ٨١)

ئەم دوورە دەستییەی سالم لە شاری تاران، وای لە سالم و کوردی کردووە کە چەندین نامەی شیعری ناوازە بۆ یەکتری بنووسن، هەر بۆیە لە هۆنراوەیەکی کەیدا سالم بۆ کوردی دەڵێت:

**لە کونجی میحنەتا هەردەم، خەیاڵی وەسڵی دولبەرکەم،**
**وجوودم، وا بەجارێ دێتە جونبوش، وەختە پەڕ دەرکەم.**
**لە ئەووەڵ حەرفیا، وەک دڵ، لە کاغەز بەردەبێ ئاگر،**
**ئەگەر، شەرحی شەرارەی ناری هیجریم سەبتی دەفتەرکەم**

ڕوون و ئاشکرایە سالم لە شاری تاراندا چەند نائومێد و بێزار و لە خۆ چوون بووە، ئەوەندە بێزار بووە، دەڵێت: ئەگەر باسی ناخۆشی و نەهامەتییەکانی ئێرەت بۆ بکەم، لە یەکەم پیتی وشەکانم کە دەیخەمە سەر کاغەز، ئاگر لە کاغەزی بەردەستم بەردەبێت... بەڵام ئەم نائومێدبوونەی سالم لە شاری تاران و بیرکردنی دوو ئامۆزا.. وای لە سالم کردووە بە هەر شێوە و شێوازێک بووە، خۆی گەیاندووەتە شیوەکەڵ و جووتە ئامۆزا یەکتریان دیوە....

بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا وەڵامی دووبارەی کوردی نەدۆزراوەتەوە و بڵاونەکراوەتەوە....

کوردی شاعیر لە هۆنراوەیەکی تریدا کە بۆ سالمی نووسیوە، دەڵێت:

**لە کونجی بێ کەسیدا فەردم ئەمرۆ،**
**زەلیل و زار و بێ هەمدەردم ئەمرۆ**
**شەماڵ نامەی زەلیلی و بێ کەسیی من**
**بەرە بۆ یاری دڵ پڕ دەردم ئەمرۆ**

(د. کور. لا ٤٧٢)

سالمیش بەم چەشنە وەڵامی دەداتەوە:

**لە زیندانا کە بێ هەمدەردم ئەمرۆ**
**ئەسیری ناکەس و دڵ بەردم ئەمرۆ**
**لە دارولوزنی دووریدا سەبا بوو**
**گەیاندی نامەیی هەمفەردم ئەمرۆ**
**لە پام گەر بەندە، (دەر)، وازە لە مەیلم**
**دڵم لاتە زەبوون و زەردم ئەمرۆ**

تاکو ئێستا ئەوە زانراوە کە سالم لە شاری تاراندا بووە و ماوەیەک خەریکی خوێندن بووە، بەڵام ئەوە ڕوون نییە و نەزانراوە سالم لە شاری تاراندا بەدیل گیرابێت، لەم نامەیەدا کە مامۆستا حەمە بۆر بۆ یەکەمین جار لە دیوانی کوردیدا بڵاوی کردۆتەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سالم لە شاری تاراندا بەدیل گیراوە، بەڵام ئەو دیلییە لەسەر چیی و بۆچی بووە؟! ئەوە هەر خوا خۆی دەزانێت....

لە بەیتی دووەمی شیعرەکەی کوردیدا ئەوەم بە یاد دێنێتەوە کاتێک موحەممەد حەنیفە لە جەنگدا دەبێت و زەلیل دەبێت بە دەستی دوژمنەکانییەوە، بەم شێوەیە باس لە نامەیەکی خۆی دەکات بۆ پێغەمبەری خودا (د. خ):

**موحەممەد واتش: یا شەماڵ شەبگیر**
**ئاما نە دەماغ مەدۆ بۆی عەبیر**
**واتش: ئەی شەماڵ نیازم ئێدەن**
**موشکڵم کەفتەن، بە تۆم ئومێدەن**
**خەتێوەم نوویستەن، بە هوون دڵان**
**بەرۆن جە عەرزەی خەستەی خجڵان**
**بە تاو و تەعجیل، بەڕێش بە ڕاوە**
**بدەریش بەدەست ڕەسوولەڵڵاوە**
**بای شەماڵ واتش: ئەی بەرگوزیدەم**
**عەرزەت مەگێرۆن وە بان دیدەم**
**قەترە مەپێکۆ ئیمشەو تا سەحەر**
**سوبح مەدۆش ڕەسوول سەروەر**



**شەماڵ عەرزەش سەند، گرت بە سینەوە**
**ڕوو نیا وە ڕای شای مەدینەوە**
**وەر جە شەماڵەی شەمس زەڕین باڵ**
**شی وە مەدینەی موبارەک شەماڵ**
**تەقەشدا نە دەرب، تەشابەی مەجمەر**
**ڕووی بەڕووی میحراب، ڕەسوول سەروەر**
**ڕەسوولەڵڵا وات: بووینین چێشەن؟!**
**بای شەماڵ ئاما، ئەحواڵێ پێشەن؟!**
**ئەسحابەی تەشاب، مەجمەرش داوە**
**خەتش دا بەدەست ڕەسوولەڵڵاوە**

(داستانی موحەممەد حەنیفە، هێشتا چاپ نەکراوە)

هەر لەو دوورە دەستییەی سالم بۆ کوردی و کوردیش بۆ سالم، جارێکی دیکە کوردی شیعرێکی تر بۆ سالم دەنووسێت، ئەم شیعرەش پڕاوپڕە لە بۆنی دووری و ئەو دوورە دەستییەی سالم کە لە شاری تاراندا گیرۆدە بووە و ناتوانێت بگەڕێتەوە شارە خۆشەویستەکەی خۆی، کوردی دەڵێت:

**شیختنی بهجرک والله یاصبی**
**ڕەحمت براله بۆ کەی و، جەورت هەتا بەکەی؟**
**دائیم لە دەوری خاڵی ڕوخت بێ قەرارە دڵ**
**هەر وەک لە دەوری قوتبی فەلەک دائیرەی جودەی**

تاکو لە کۆتایی هۆنراوەکەدا دەڵێت:

**(کوردی) لە هیجری (سالم)ە وا غەرقی میحنەتە**
**ڕەحمت براله بۆ کەی و جەورت هەتا بەکەی**

(د. کو. ب ٢. لا ٢٥٦)

لە کۆتا بەیتی ئەم هۆنراوەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە سالم لە وڵاتی خۆیدا نەبووە، هەر بۆیە کوردی دەڵێت: کوردی لە دووری سالم وا خەریکە نوقمی ناخۆشی دەبێت...

سالمیش لە وەڵامی کوردی دا دەڵێت:

**جانانە حاڵی ئەم دڵە گەر جوستوجوو دەکەی**
**مەشغووڵی ناڵەیە لە جودایی بە میسلی نەی**
**(چهرەات کە پیش أزین بصفا رنگ لاله بود)**
**ئێستێ دەبا لە حینی خەزانا گرەو لە بەی**
**چاوت لە بەزمی بادەکەشان بێت و عیشوەکا**
**ناکەین بە ڕەسمی نەشئەیی مەستی هەوایی مەی**
**غەم جەیشی سەلموتوورە دێتە سەر ئیرەجی دڵم**
**بۆ شۆڕشی لە وەغا چۆڵی سینە بوو بە ڕەی**
**(سالم) دەلیلە مەصرەعی (کوردی) بڵێ بەیار**
**ڕەحمت براله بۆ کەی و جەورت هەتا بەکەی**

ئەگەر تەماشایەکی ئەم هۆنراوەش بکەین، ئەوا دەبینین سالم دوورە دەستییەکەی کە لە شاری تاراندا بەچی ناو دەبات، بە ناوهێنانی (جەیشی سەلم و توور) کە دوو سوپای سەر بە یەک بنەماڵەن، بەهۆی ناکۆکی خەڵکانی تری و فیتوفاتەوە دوورەبەکی کەوتە نێوانیان و بوون بە دوو تەرەفەوە، ئەم دوانە هەر جارە و یەکیان هێرشی دەکردە سەر ئەوی تریان، سوپای سەلم و توور لە شانامەی فارسی و کوردیدا باسی زۆرە، سالم و کوردیش بۆ ئەوەی سوپای غەم و هەم و دووری دوو بەرەکی نەخاتە



نێوانیانەوە، دەڵێت: سوپای خەم (ناحەز) لەنێوان سوپای سەلم و تووردا هێرشی کردە سەر ئیرەجی دڵم... (نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە ئیرەجیش سوپایەکی هەبووە و سەر بە بنەماڵەی سەلم و توور بووە). واتە: سالم دەڵێت: هەر لە کەسێکی خۆمانە وا خەریکە ناحەزی و دووبەرەکی دەخاتە نێوانمانەوە بۆیە دەبێ بۆ ئەم کارە ئێمە شۆڕشی لە وەغا دەشتی (ڕەی) چۆڵ بکەین، ئەم دەشتی ڕەیە من وا دەزانم سالم هەر مەبەستی لە موڵک و زەوی و زاری بنەماڵەی خۆیان بێت لەگەڵ شاری سلێمانیدا... جگە لەوەش سالم کە میسرەعی کوردی دووبارە دەکاتەوە، مەبەستی لەوەیە دەبێ هەموویان یەک بگرنەوە نەهێڵن ناحەز دەست بخاتە ناو کاروباری میللەت و خەڵکی و بنەماڵەکانەوە و هەموویان لەناو یەکدا تەبابن.

کوردی لە هۆنراوەیەکی تریدا بۆ سالم دەڵێت:

**ڕەفیقی کونجی میحنەت، عاجزن هەر شەو لە ناڵینم**
**گوریزانن لەبەر لێشاوی مەوجی بەحری ئەسرینم**
**ئەگەرچی ڕۆژ و شەو مەشغوڵی نەغمەی موطریبم ئەمما**
**لە تەم خاڵی نییە ساتێ دڵەی مەفتوون و غەمگینم**
**نە هەر دەردی منە تەنیا، ئەمە دەردی هەموو لایە،**
**بەجارێ فولکی شێواوە، لە نەگبەت ماه و پەروینم**
**هەزار خۆزگەم بەخۆت دووری لە شاری پڕ بەڵا و میحنەت**
**لە فرسەتدا منیش هەڵدێم لە تەڵخیی شاری شیرینم**

(د. کو. لا ٣٣٨)

کاتێک کە باری ئەمنی شاری سلێمانی تێکدەچێت، ئەو هەستە دوورییەی بۆ ئامۆزاکەی هەیبووە دەگۆڕێت بە جۆرێکی دیکە، وەکو دەبینین لە هۆنراوەکانی پێشوودا کوردی زۆر ئارەزووی بینین و گەڕانەوەی سالم دەکات، بەڵام لەم هۆنراوەیەدا پێچەوانەی هۆنراوەکانی دیکەی، دەڵێت: ئەگەرچی شەو و ڕۆژ سەرقاڵی خواردنەوەی مەی و دەنگی بادەم، بەڵام لە تەم تومانە ساتێک خاڵی نییە دڵ و شاری من... منیش مات و غەمبارم و...

ئەمە بە تەنها دەردی دڵی من نییە، بەڵکو دەردی هەموو لایەکمانە و بەجارێک ڕێڕەوی سووڕانەوەی ئەستێرەکانیش تێکچووە، ئەمەش لە نەگبەتی مانگی منە، هەزار خۆزگەم بە تۆ (سالم) کە دووری لە شاری خۆت کە سلێمانییە، شاری سلێمانی پڕی لە بەڵا و ناهەمواری بووە، لە هەر دەرفەتێکدا بێت منیش لە شاری سلێمانی هەڵدێم و خۆم



دەستنوسی کەشکۆڵی شیعری (کوردی)



(دەگەیەنمە لات...؟!)

لەم هۆنراوەدا ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە سالم لە شاری تاران بووە و باری ئەمنی شاری سلێمانی تێکچووە، هەر بۆیە کوردی- یش تەواو بێزار و بێتاقەت بووە لەو بارە ناهەموارەی شاری سلێمانی و لەم نامەیەدا بە سالم دەڵێت: منیش لە دەرفەتێکدا خۆم دەرباز دەکەم و دەردەچم لە شاری شیرینی خۆم.

سالمیش لە وەڵامی کوردیدا دەڵێت:

**ڕەفیقی گۆشەیی غوربەت، هەراسانن لە ناڵینم**
**لە ئەشکی دیدە ئەمشەو باز لە خوێنا مەوجە باڵینم**
**عوروجی سەند لە سەنعان وەزعی ئەحواڵم لە ڕێی عەشقا**
**مەگەر ئوستادی تەرسایە، بەخەسڵەت یاری بێ دینم**
**چ جای دڵ، جان لە شەوقا خوێن بەچاو دێنێ ئەگەر جارێ**
**خەفا بێ، پێی سەگی کاتن حەنایی، ئەشکی خوێنینم**
**لە غەم ئێستەم دەبینی وای دەزانن ئەووەڵی دەردمە**
**دەمێکە بێ خودی هیجری دیار و یاری دێرینم**
**ئەگەر دوورم بەلەش، ئەمما بەدڵ بیللا لەگەڵ تۆدام**
**لە ئەحواڵی وڵات ئاگام و بووەتە مایەیی شینم**

(د. کو. لا ٣٤٢)

لە وەڵامی سالم بۆ کوردیدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سالم پێش هەموو شتێک ئاگاداری هەموو ئەو نەهامەتیانە بووە کە بەسەر وڵاتەکەیدا هاتووە، جگە لەوەش دەڵێت:

هاوڕێی گۆشەی دوورە وڵاتم هەراسانە لە ناڵینی ئاە و زاریم، لە فرمێسکی چاوەکانمدا ئەمشەو دووبارە خوێن مەوجی داوە... بۆ هەواڵ پرسینی ئەحواڵی عەشقی سەنعان... ئەویشی بردووە و ڕۆشتووە، مەگەر ئەو مامۆستای کەنیسە نییە؟! یاری بێ دینم... ئەو نەک تەنها دڵی منی بردووە ( لێرەدا مەبەست لە کوردی شاعیرە)... بەڵکو هەموو شتێکی لەمن وەرگرتووەتەوە. لە خەمی ئێستامدا هەموان وا دەزانن سەرەتای دەردی منە، نەخێر، دەمێکە بێ هۆ و هۆکار لە دووری ئازیزاندا دیارە یاری دیار و دێرینی من کە کوردییە، ئەگەرچی بە لەش لێی دوورم، بەڵام بیللا لەگەڵ تۆدا ئەژیم و لە هەواڵی وڵاتی خۆیشم ئاگادارم... ئەم هەموو شتانەش بووەتە مایەی شین و زاریم.

لە نامەیەکی دیکەدا کوردی دەڵێت:

**موشتاقە دڵم لەو دەمەوە چۆڵە مەقامەت**
**بۆ بیستنی ئەشعاری پڕ و خۆشی کەلامەت**
**دڵ تابی غەمی هیجری نەماوە بەسە ئیتر**
**تازەی بکەوە عوشرەتەکەی ساڵ و عەیامەت**
**تا شیوەکەڵت مەسکەنە شێواوە کەڵی ژین**
**ئارێ کە گومە لێم خەبەر و پەیک و پەیامەت**

(د. کو. لا ٧٧)

لەم نامەیەدا کوردی ئەگەرچی لە سەرەتاوە باسی دووری سالم دەکات، بەڵام دەریش دەکەوێت کە سالم لە سلێمانی دا نەبووە، کوردیش بۆ بیستنی شیعرەکانی سالم دڵی پڕ خەم بووە و لە دووری سالم ئۆقرەی براوە، هەر بۆیە دەڵێت: بگەڕێوە بۆ شیوەکەڵ و با لەوێدا دیسانەوە یەکتری ببینین، بۆ ئەم مەبەستەش دیدەنییە کۆنەکانی ساڵانی پێشوومان با تازە ببێتەوە... ئەرێ ئەوە چییە نامە و پەیام و پەیکت لێم ون بووە، هیچ هەواڵ و شتێکت لێوە نایەت؟!

لە وەڵامی کوردیدا سالم دەڵێت:

**قاسید لە تەرەف تۆوە سەلامێکی کە هێنا**
**قوربانی وەفای دەمبەدەم و جەوری مودامت**
**قاسید نییە ئەم پەیکە مەگەر خزری نەجاتە**
**بەخشیی بەمنی موردە حەیاتێ بە سەلامت**
**ئارێ کە دڵ ئاوێنەی دڵ بێ چ عەجائیب**
**قەستەم بە سەرت شێفتەترە بۆت کوڕی مامت**
**تۆ نیتە مەگەر ئارەزوویی دیدەنی مەهجوور؟**
**سا دەی وەرە ئەی مەردمەکی دیدە مەقامت**



**تا سەجدە بەرن، کەبکی دەری بو بەری پێی تۆ**
**سا هەستە، بکەن خۆش ڕەوشان مەشقی خەرامت**
**کوشتت کە هەموو مونتەزیری شۆڕشی حەشرن**
**قەد دەرخە هوەیدا کە قیامەت بە قیامت**
**تەئسیری عەشق یانە لە ئەوسافە فلانی**
**(سالم) کە تکا شەهدی چەکیدەی لە کەلامت**

(د. کو. لا ٨٠)

سالم لەم هۆنراوەدا ئەوە دەخاتە ڕوو کە گەڕاوەتەوە بە نهێنی دەڵێت وەرە بۆ ئەو جێگەیەی خۆت ناوت بـردووە، لە هۆنراوەکەدا دەردەکـەوێـت سالم لەو نێوەندەدا بەهەر شێوە و شێوازێک بووبێت گەڕاوەتەوە بۆ شیوەکەڵ و ویستوویەتی چاوی بە موستەفا بەگی کوردی بکەوێت.

دوا وتەی من لەبارەی نامەکانی کوردی و سالمەوە: لە کۆی ئەو نامانەی کوردی بۆ سالمی ناردووە و سالمیش وەڵامی داوەتەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە سالم ماوەیەکی زۆر لە شاری سلێمانی دا نەبووە، کاتێک کە لەتاراندا بووە، جگە لە سەردەمی لاوی کە لە شاری تاراندا خوێندوویەتی، ماوەیەکیش دیل بووە و لە بەندیخانەدا بووە، هەر بۆیە لە ناوەڕۆکی نامەکانی کوردیدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە سالم لە بەندیخانەدا بووە، سالمیش لەو دوورە دەستییە وەڵامی کوردی داوەتەوە، جگە لەوەش ئاگاداری باری سیاسی وڵات بووە...

جگە لەوەش لە بارە ناهەموارەکانی شاری سلێمانی دا کوردی و سالم لە شیوەکەڵدا یەک دوو جاران یەکترییان دیوە، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا لە ناوەڕۆکی نامەکانی نالی و سالم و کوردی و سالم و نالی و کوردی بە وردی نەکۆڵراوەتەوە، هیوادارم لەم خوێندنەوە سەرپێیەی منیشدا کە لە سەفەردا بووم و سەرچاوەی پێویستم لەبەردەستدا نەبوو، بەپێی ئەو زانیاریی و درکانەی خۆم کە لە نامەکانی سالم و کوردیدا هەستم پێ کردووە، خستوومەتە ڕوو، لێکۆڵەران و توێژەرانی بەڕێزی بواری زانستی لەو نامانە بکۆڵنەوە و بە ڕوونی باسی لێوە بکەن و بڵاوی بکەنەوە.

هیوادارم لە هەڵە و کەموکورتییەکانم ببوورن، چونکە لە سەفەردا بووم، کاتێکیش کە گەڕامەوە ماوەی زۆرم لە بەردەستدا نەبوو، هیوادارم ناوەڕۆکی شیعرەکانم بەدروستی خوێندبێتەوە و ڕوونم کردبێتەوە.





# لەبارەی مستەفا بەگی کوردییەوە

**جەبار سابیر**

ڕەنگە تاقە میراتی هەزاران ساڵەی ئێمە وەک کورد لەسەر ئەم خاک و ئاوە، تەنها شیعر بێت. شیعر پانتاییەکی زۆری لە ڕابردووی ئێمە داگیرکردووە و لە هەر لایەنێکەوە لە کورد بدوێین، دەبێت بچینەوە سەر شیعر و شیعر تاقە سەرچاوەی بوونی ئێمەیە بە درێژایی ئەو سەردەمانە. ئێمە لەو شارستانێتی و فەرهەنگەی کە باس دەکرێت، تەنها شیعرمان بۆ ماوەتەوە و لە ڕێگەی شیعریشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئێمەیش وەک ئەو نەتەوانەی دەوروبەرمان هەوڵمان داوە لەگەڵ کاروانی شارستانی مرۆڤدا بڕۆین. ئێمە نەتەوەیەکین بە هۆی داگیرکاری بەردەوام و لەشکرکێشی هەمیشەیی دوژمنەکانمان لەسەر ئەم خاکە، مێژوومان شێواوە و هەرچی هەمان بووە تاڵان کراوە و لەم ناوەیشدا زۆرمان لە دەستداوە کە ڕەنگە دیارترینیان ئەو زانا و دانایانەی بواری ئایینی ئیسلام و شاعیرەکانمان بن. (دینەوەری و ئامێدی و شارەزووری و ئیبن خەلەکان) و زۆریتر کوردبوون و خزمەتێکی بەرچاوی ئایینی ئیسلامیان کردووە و بە هۆی داگیرکارییەوە ڕەگ و ڕیشەیان لە کوردستان و کوردبوون سڕدراوەتەوە و ئەوەندەی عەرەبەکان دەیانناسن و شانازییان پێوە دەکەن ئێمە نایانناسین و شانازیشیان پێوە ناکەین. دەڵێن (بابە تاهیر)ی هەمەدانی کوردە، بەڵام فارسەکان کردوویانەتە هی خۆیان و بەردەوام شیعرەکانی بە جوانترین شێوە چاپدەکرێتەوە و لە دەست کورد دەردەچێت. ڕەنگە ئەم نموونانە بەس بن بۆ ئەوەی کە لەوە تێبگەین ئێمەیش هەبووین و کارمان کردووە و بەڵام نەبوونی دەوڵەت و قەوارەیەکی سیاسی و سەربەخۆ کارێکی وای کردووە نەتوانین ئەوانە بپارێزین و وەک میراتی خۆمان بیانهێڵینەوە و شانازییان پێوە بکەین. شیعری کوردی دەورانی کلاسیک لە ناوچەی ژێر زاری (گۆران) و لقی سۆران، یا وردتر بڵێین ئەوەی پێی دەڵێین (سۆرانی) لە سەردەستی سێ شاعیر قەڵەمبازێکی پێدرا و دواجار گەیشتە ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە ئەم وتارەی پێدەنووسین. ئەم سێ شاعیرە (نالی و سالم و کوردی) بوون. ڕەنگە قسەی زۆر لەسەر شیعرییەت و شێواز و داهێنانی ئەمانە کرابێت و بە درێژایی سەدەی بیستی ڕابردوو

ئێمە شەنوکەوی شیعری ئەم  سێ شاعیرەمان کردووە و بەردەوامیشین. بەڵام من لێرەدا دەمەوێ لە گۆشەنیگایەکی دیبەوە سەیری شیعری ئەم سیانە و بەتایبەت (مستەفابەگی کوردی) بکەم و چەند دێڕێکی لەسەر بنووسم. یەکێک لە ڕەگەزە گرنگەکانی شیعری ئەم سێ شاعیرە ئەوەیە زمانیان پێش زمانی دەسەڵات دەکەوێت و ئەمەیش بۆ ناوچەیەکی وەک ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کارێکی داهێنەرانەیە. هەمیشە شاعیران و نووسەران و ڕۆشنبیران بە گشتی شوێن زمانی دەسەڵات کەوتوون و بەو زمانە نووسیویانە. بەڵام ئەم سێ شاعیرە ئەو هاوکێشەیە هەڵدەوەشێننەوە و پێچەوانەی دەکەنەوە. بۆیە دەبینین دەسەڵاتی میرانی بابان لەو سەردەمەدا پشت لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی دەکات و ئەم زمانە نوێیەی ئەوان هەڵدەبژێرێت کە تا ئەو کاتە فەرمییەتی نەبووە و وەک زمانێکی زۆر لۆکاڵی و ناوچەیی سەیری کراوە. لە دوای کۆتایی هاتنی سەدەکانی ناوەڕاست و ڕووناکبوونەوەی ئەوروپا بە خۆری ڕێنیسانیش، کە لە ئیتالیاوە هەڵهات و ڕۆشنبیرانی ئەوێ سەر قافڵە بوون، (دانتێ) یەک لەوانە بوو بە نووسینی (کۆمیدیای یەزدانی) بناغەی بۆ زمانی ئێستەی ئیتالیا داناو پشتی لە زمانی لاتینی و نووسین بە لاتینی کرد و ئەمەیش دانتی کردە باوکی ئەو زمانەی ئەمڕۆ ئیتالییەکان پێی دەنووسن و پێی دەئاخڤن. لای فارسەکانیش (فیردەوسی) ئەم کارەی کرد و بە نووسینی (شانامە) توانی زمانی فارسی لە ژێر دەستی زمانی عەرەبی دەربهێنێ و تاموبۆیەکی تەواو فارسییانەی بداتێ کە لەگەڵ ئەو جوگرافیایەدا بگونجێ. کاری ئەم سێ شاعیرەیش لە کاری دانتێ و فیردەوسی کەمتر نییە بۆ ئێمەی کورد. لە دوای ئەم سێ شاعیرەوە زمانی کوردی بەرەو پاراوی چووە و بە بڕوای من گرنگی شیعری ئەم سێ شاعیرە بەر لە هەر شت ئەم بابەتەیە کە باسم کرد. لە ناو ئەو سێیەشدا مستەفا بەگی کوردی جێگەی دیارتری هەیە، ئەم قسەیە دەکەم لە شان و شکۆی حەزرەتی نالی و سالم کەم ناکەمەوە، من مەبەستم لایەنی زمانی شیعرییە، پێموایە زمانی شیعری لای مستەفا بەگ لە زمانی نالی و سالم پاراوترە، پاراوتر بەو  مانایەی هێڵێکی نەبینراو هەیە کە تەواو دایدەبڕێت لەو ڕوتە کلاسیکییەی سالم و نالی. هەستەکەیت کوردانەترە. قاڵبەکانی زۆر کوردین. بەڵام کەس لە نالی شاعیرتر نییە. کەس لە سالم کوردتر نییە. کوردی زۆر پاراو نووسیوێتی و گوێی بە بنەما کلاسیکەکان نەداوە کە دەبێت عەرەبی و فارسی و تورکی لە شیعرەکانیدا هەبێت ئینجا وەک کلاسیک لە قەڵەم بدرێت. ئەمە لای نالی و سالمیش هەروایە، بەڵام نالی و سالم کەمتر لە بۆتە کلاسیکییەکان لایانداوە و وەک کوردی خۆیان لە کۆتوبەندی کلاسیک ڕەها نەکردووە. کوردی ئەمەی لە خۆیەوە نەکردووە و زۆر ورد کاری کردووە و حسابی بۆ هەموو وشەیەکی کردووە و دەتوانین وەک دیوارێک وێنای شیعری کوردی بکەین و هەر وشەیەکی بە خشتێک بزانین و بە دەرهێنانی هەر خشتێک شیعر و زمانی (کوردی) کەلی تێدەکەوێت. دەتوانین لەم شیعرە وردبینەوە تا بۆمان دەربکەوێت لەو سەردەمەدا ئەم شاعیرە بە چ کوردییەک نووسیوێتی و چ زمانێکی شیعری هەبووە.

**سەدای سەمتوورە کەللەم گەرمە ئەمشەو**
**چریکەی بانگی دڵ بێ شەرمە ئەمشەو**
**بە ناخوون کاری فەرهاد دێ لە دەستم**
**وەها شاهۆ لە ناڵەم گەرمە ئەمشەو**
**لە تەنیایی بە یادی ڕۆحی مەجنوون**
**خەیاڵی گەشتی دەشت و دەرمە ئەمشەو**
**غوباری خاکی وا حەق گەر بەهەشت بێ**
**لە دەرگای تۆ خەبەر ئاوەرمە ئەمشەو**
**دڵم وەک حاکمی مەغدوورە قوربان**
**تەمای سەنعاتەکەی ئازەرمە ئەمشەو**
**ئەگەرچی یار و یاوەر بوون بە دوژمن**
**خەمی بێ یاوەری یاوەرمە ئەمشەو**
**لە دووریشم گەڕا پەروانە ناکام**
**لە سەر ڕێی وەسڵی نووری هیجرە ئەمشەو**
**کە چونکە بۆی ویسالی تۆی تێدایە**
**نەسیمی سوبح خەبەر ئاوەرمە ئەمشەو**
**سەرم شۆڕی ویسالی کەوتە سەر باز**
**دیسان "کوردی" لە دەردی سەرمە ئەمشەو**

لەم شیعرەدا دەبینین کوردی زۆر تەنیا کەوتووە و دەیەوێ شیوەن بۆ تەنیایی و بە جێماوی خۆی بکات، بەڵام وشیارە لە هەڵبژاردنی وشە و وێنەکاندا و زۆر شاعیرانە وێنەکانی دروستکردووە و بە وشەی زۆر گەورە شتی زۆر سادەی وتووە و بە درێژایی شیعرەکە وشەیەکی زیادە نییە کە بتوانی دەریبهێنی و شیعرەکە وەک خۆی بمێنێتەوە. "ئەگەرچی یارو یاوەر بوون بە دوژمن". لێرەدا کوردی یار و یاوەری لێبۆتە دوژمن، تا ئێرەیش بۆ ئەو ئاساییە و لە ڕێگەی ئەم شیوەن نامەیەوە کوڵی دڵی دادەمرکێنێتەوە. بەڵام کاتێک بارودۆخەکە بۆ ئەو قورستر دەبێت کە خەمی بێ یاوەری دەبێتە یاوەری. "خەمی بێ یاوەری یاوەرمە ئەمشەو" چەند بارەکردنەوەی وشەی "یاوەر" لەم شیعرەدا و هەر جارە و بە مانا و مەبەستێک بەڕاستی بۆ خۆی هونەرە و ڕەنگە هەر بە شاعیرێکی وەک کوردی کرابێت. سەرباری ئەمەیش شتێک کە جێگەی سەرنجە بۆ من ڕۆشنبیری کوردی و خوێندەوارییەکەیەتی ناوهێنانی ئامێری "سەمتوور" بەم شێوازە کوردییە، فارسەکان پێی دەڵێن "سنتور" ئەم شیعرە هاتووە کردوێتییە کوردی و ئێستایش ئێمە لەسەر ڕێنووسی ئەو پێی دەڵێین سەمتوور.



# موشتاقە دڵم
# نامەی (کوردی) بۆ (سالم)



**موشتاقە دڵم، لەو دەمەوە چۆڵە مەقامت**
**بۆ بیستنی ئەشعاری پڕ و خۆشی کەلامت**
**دڵ تابی غەمی هیجری نەماوە بەسە ئیتر**
**تازەی بکەوە عوشرەتەکەی ساڵ وعەیامت**
**تا(شیوەکەڵ)ت مەسکەنە شێواوە کەڵی ژین**
**ئارێ کە گومە لێم خەبەر و پەیک وپەیامت**
**ئەی جیلوەیی خاشاکی...**
**شەوگاری......**
**خۆت چاکی دەزانی...**
**کەی شەرتی وەفا و دۆستییە......**
**پیکاوتە دڵ وشیفتەیی...**
**چاوم لە دەری مەقدەمی......**
**مەحرومی سەری(لوتف)ی ئە(بیمار)ییە (کوردی)**
**بۆیێ کەسەری (سالم)ە لە هیجرانی بەسامت**

## وەڵامی(سالم) بۆ (کوردی)

**ئەی طاسی بەدەن پوڕ فەرەحی لەزەتی نامت**
**وەی داغی دڵی خەستە نمەک سوودی کەلامت**
**ئەی سونبولی زوڵفت هەمە دەم عەتری مەشامم**
**وەی زێوەری سەر چەشمەیی چەم قەددی نەمامت**
**ئەی گەردنی جانم بەئەبەد حەبسی کەمەندت**
**وەی مورغی دڵی شێفتە پەڕبەستەی دامت**
**ئەی جان بەفیدای نوکتەی شیرینی دەهانت**
**وەی سەر** بەنەثاری **قەدەمی پەیک وپەیامت**
**قاصید لە تەرەف تۆوە سەلامێکی کە هێنا**
**قوربانی وەفای دەمبەدەم و جەوری مودامت**
**قاصید نییە ئەم پەیکە مەگەر خدری نەجاتە**
**بەخشی بەمنی موردە حەیاتێ بە سەلامت**
**ئارێ کە دڵ ئاوێنەی دڵ بێ چ عەجائیب**
**قەستەم بە سەرت شێفتەترە بۆت کوڕی مامت**
**تۆ نیتە مەگەر ئارەزوویی دیدەنی مەهجوور؟؟**
**سا دەی وەرە ئەی مەردمەکی دیدە مەقامت**

**تا سەجدە بەرن، کەبکی دەری بۆ بەری پێی تۆ**

**سا هەستە، بکەن خۆش ڕەوشان مەشقی خەرامت**

**کوشتت، کە هەموو مونتەزیری شۆڕشی حەشرن**

**قەد دەرخە هوەیدا کە قیامەت بە قیامت**

**تأثیری عەشق، یانە لە ئەوصافە فلانی**

**(سالم) کە تکا شەهدی چەکیدەی، لە کەلامت**

## زەمانی فیرقەتی یارانە
## چامەی یەکەم

**زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو،**

**لە چاوەی چاو کە خوێن بارانە ئەمشەو**

**زەمانە ڕۆژی کردینە شەوی تار**

**صەفای(ئەستانە) و (تاران)ە ئەمشەو**

**ئەگەرچی جەژنی خەڵقە، وا لە بۆ من**

**هەوایی تەعزیەدارانە ئەمشەو**

**لەلایێ شین و، لایێ بەزم و شادی**

**یەقین دیاریی ستەمکارانە ئەمشەو**

**بەباڵای دڵ، کە کاڵای غەم بڕاوە**

**وەکو تەختی بەبە وێرانە ئەمشەو**

**لە گوێی دڵدا صەدایێ دێت مەزننە**

**زڕەی زنجیرەکەی جارانە ئەمشەو**

**زڕەی زنجیری دڵ پەیوەستی عەرشە**

**لە دووریی ڕوویی دڵدارانە ئەمشەو**

**زڕەی زنجیر و کۆتی دڵ کە هەڵسێ**

**نیشانەی کۆچی شا و یارانە ئەمشەو**

**عەجائب نامرێ (کوردی) ڕەفیقان**

**کە وەختی ڕیحلەت و هیجرانە ئەمشەو**

**١-زەمانی: کاتی، دەمی، هەڕەتی، سەرێنی، سەردەمی-بێگومان ئەم هەڵبەستە دوای ڕووخانی بابان و ڕەوکردنی گەورە پیاوانی بووە لە(سلێمانی)لەتاو خراپی عوسمانییەکان.**

**فیرقەت: لێک بڕان، جیایی، جیابوونەوە، ڕەوکردن.**







## زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو
## چامەی دووەم

زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو
ئوفوولی زوهرەیی پایانە ئەمشەو
بڵێسەی ئاگری شەوقی دەروونم
وەکو دۆزەخ سزای طۆفانە ئەمشەو
لە ئەشکی لەعل گوونی چاوی تارم
لە ئەفلاکا مەلەک گریانە ئەمشەو
لەبێ ئارامیا،چۆن شەق نەبا دڵ؟؟
لە جەوری دڵڕەقی جانانە ئەمشەو
تەرازووی دەهرە،خۆشی بێ لە ئەغیار،
کە جووتەی شایەن و شایانە ئەمشەو
لە کەعبەشدا، لە ئەغیار(صەد)بەرائەت
کە هێند بێ شەرت و بێ پەیمانە ئەمشەو
کەوا شاهم لەسەر عەزمی ڕەحیلە
دڵ وجانم لە ڕێی، پایانە ئەمشەو
سەرم مەستی شەرابی ئەشکی سوورە
لە جۆشی دڵ جگەر بریانە ئەمشەو
عەشق گەرچی بە ئازاریشە (کوردی)
فیراق پارسەنگی دەرد و ژانە ئەمشەو

## زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو
## چامەی سێیەم

زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو
شنۆی بای هیجری نازدارانە ئەمشەو
صەدای تەپڵی فیراقم دێتە گوێوە
سەعاتی نەحسی بێدارانە ئەمشەو
فیراقی یارە، ڕێی هات و نەهاتە
ڕەحیلی شاە، ڕووەو شارانە ئەمشەو
لەصەحرای سینە خاری غەم ڕوواوە
لە هەوری دڵ، خەفەتبارانە ئەمشەو
کەبابی دڵ لە ئەشکی دیدە سوێرە
لەکن من جەژنی مەیخۆرانە ئەمشەو
بەڕوومدا قەطرەیی ئەشکم کە دەتکێ

خیطابی دەستی ئەغیارانە ئەمشەو
حەریری زەرد و سووری ڕەنگ و ئەشکم
مەتای کاروانی غەمبارانە ئەمشەو
حەیات و مەرگ و وەصڵ و هیجر جووتن
دەڵێی بوحرانی بیمارانە ئەمشەو
مەکەن مەنعم لە ئاه و ناڵەی (کوردی)،
صەبووری، خووی ڕیاکارانە ئەمشەو

## دڵ لە میحنەت کەیلە

-دڵ لە میحنەت کەیلە ئەی (پیری موغان)ی بەزمساز
هەر ئەتۆی بۆ بارەگای عەیشوطەرەب مەسنەد طیراز
دەی، ئەتۆی خەرمانی عومری غەم بەبادی، بادە، دەی
دابزانین، مەشغەڵەتمان چۆن دەخەیتە گیر وگاز
جان، فیدای سروەی دەم و،دەستانە، ئێوەش بێنەوە
(چاوەش) و یارانی(جان)،مۆسیقە سازان ونەواز
(سمکە)تۆش دەستەی (سەما) و(سوور)ت بسوورێنە بەسۆز
با، لە بەزمی ئێمەدا، هی ئێوە بێ دەستی دراز
ئەی بەرەی (داوودی) نۆرەی نەغمەخوانی ئێوەشە
هەر لە ماه، تاکو بەماهی بێننە لەرزە و تەکووتاز
گەرچی فەیضی ئێوەی تەعطیری دڵ و گوێ و چاو دەکا
بۆ دەماغ و جانە نەشئە و قووتی ئاسمانی فیراز
بانگ کەنە (زاهید)، نەمان ڕەندانی گۆشەی (خانەقا)
بێن کەوازە دەرکی مەیخانان و خەڵوەتگاهی ڕاز
خوابی غەفڵەت (نازلە) بۆ چاوی (شەحنە)و (موحتەسیب)
فرصەتە، جامێ ئەسەر کێشین بەڵا، بێ ئیحتیراز
مەی حەرامە گەر بە فتوای (موفتی)ی و (قەولی جەدید)
(پیر)ی من جار جار بە (قەولێکی قەدیم) داویە (جەواز)
با لەشەرتی بادە، مەرد ئەفگەن بێ ساقی نەوجوان
دیدە سێوەنگی و کڵاو کەچ کاتو دوگمەی سینە واز
(زوڵف)و (کاکۆڵ) و (غولامانە)ی هەموو ئەفشان بکا
بێ بەزانوودا بدا جامێ بە عیشوە و شەرم و ناز
با هەموو، خۆمان بکەینە (خوم) لە هەستیدا هەتا
خەم بە پێچ و خەم وەکو سەگ شەق ئەکا صۆفی بەراز
فرصەتە یاران شەوێکە و ئەمشەوە سا وەرنەوە
بێنە جۆش، دەرچن لە طهوری پیسی دونیای حوقەباز
دەستی (یار) و گەردنی قەڕڕابە لێوی جامی مەی



فێس و تەرلک بگرێ دەوری دیدەکانی میثلی باز
(ئاغە زەننون) لێ بدا (سینەکەمان) (فارس) (گرفت)،
(ئەلکە) (تەنبوور)و (دەف) و (ئەسعەد)بدا دەستی (بەساز)
با (ڕەسوڵ) هەڵداتە (ڕاست)، (صاڵح) بڵێ (نیوەشەوی)
(محییەدین)، (چوارگا)و (قەرە) دەنگی بڵند کا بۆ (قەزاز)
(خاوکەر)ەی (خانم)ە (قەتار)ەی (صۆل) و (سۆزە)ی (نەسمەجان)
(ڕەقص)ی (سمکە)، (ناز)ی (شەهر ئاشووب) و (غەمزەی) (سەرووی ناز)
(سووڕ) و (بستە)ی گورجی (گورجیی) و سوبک خێزیی (شاپەسەن)
بۆڕ ئەدەن ئەفسوونی جوملەی جادوکار و حیلەباز
(دائیرەی میصری) و (چەقانە)ی (گەوهەر) و (لەنجە)ی (سەمەن)
دەنگی (چاوش) بێ و (بەڵا) تا دێ لە گیانم بێنێ واز
(نازەنین) بۆ (نازەنین) و (دڵگوشا) بۆ (دڵگوشا)
لایقن، گەر تێ چڕێ (خوسرەو) لە دوویان (شاهناز)
چنگی ئەصغەر با بگاتە (چەنگ)و صەد دەنگ لێ بدا
پێ بەپێی ئەو دەربچێ ئاوازی (ساز)ی (گوڵبەیاز)
(مستۆ) (ئیبراهیمی) (ئەوڕەحمان) (نەوا) و (فەتحی) (حەزین)
(مستەفا) (ناری) و (سێ گا)، یوونس) و (شەهری) و (حیجاز)
هەر لە خۆیان دێ (خلە) و (پیرۆت) و (ئەوڵای مامەسەن)
(ساز)ی (عوشاق) و (ئەسیری) و (سۆز)ی (کوردی) و (شەهری ناز)
(بەربەت)ی (عیسا) و (نەقارە)ی (خاڵ) و شمشاڵی (سەلیم)
ڕەونەق ئارای ئایینەی قەلبن لە تۆز و گەردی شاز
مەرهەمی زەخمی دڵانە (سۆزناک)ی (کاکەباس)
(نەوئەثەر) بۆ (شێخە)، (ماهوور) بۆ (عەزیزی یایە ناز)
جار بەجار بە (کزێکەوە) هەستێ لە (پەردەی) (طاهری)
(یارە)کەی عاشق کوژەی مەعشووقەکەی دوشمن نەواز
با (فەرەج) (بوسلیک) بەجێ بێڵێ و بچێتە سەر (عیراق)
(کورسی ڕێحلەت) لێ بدا، دەرچی لە مەنزڵگای (نیاز)
با لە (خەتم)ا (نالە) (دەف) کون کا (دەهۆڵ) شەق پێ بەرێ
(نەی) یەکالا کا بە (ناڵەی داوودی) و ئاوازی (ناز)
با (تەپڵخانە) بەجارێ مۆر کرێ و (دۆندار)ی قڕ
قۆڵی (سەڵتە)ن بۆ ئەم و ئەو (ئەفسەر)ە گەر (باڵباز)
(تەپڵ) و (دەف) بۆ جاهی (شێخ)ە با نەمێنن دەنگ بدەن
بێنەوە بۆ بەزمی ئێمە و بابێتە ڕێگەباز
(جاە) و (سوڵتە)ی (شێخ و (میر) دێنێ دەمێ لەم مەجلیسە
تا بەگەردی پێشیا ناگەن بە پەرواز و بەباز
(مەجلیس) ئەر وابێ، هەزا (جەمشیدی جەم) فەڕاشییە
مەی ئەگەر وابێ، بەهای جامێکی (ئێران)ە و (حیجاز)





(موطریب) ئەر وا بن، فیدایان بێ (نەکیسا) و (بارەبود)
(ساقی) گەر وابێ، بەقوربانی دوو دیدەی بێ (ئەیاز)
(ڕەقص) ئەگەر وا بێت و (مۆسیقە)ش وەها بێ؟ بۆ .. نەبن
ڕاقیصەی عەبباسی و (فارابی) دەم واز و گوداز
ڕۆزگار ئاشۆفتەیە و چەپگەردە چەرخی نەیلەگوون
بێخودانە هەر کەسێ مایل  بە بەزمی وایە باز
ڕێ مەدەن لەم (بەزم)ە (شێخی) (تەکیە)، (صۆفی)ی (خانەقا)
کۆنە لۆتی جنە پەروەر سوفلەیی بەچچە نەواز
وەنییە (کوردی) مائیلی ئەم جۆرە ئەطوارانە بێ،
لازمە شاعیر لەهەر نەوعێ بڵێ بۆ ئیمتیاز.

## تاکەی ئەم جەور و جەفایەت

تاکەی ئەم جەور و جەفایەت چاو خومارەی سوخمە ئاڵ؟؟
دڵ لە هیجر و فیرقەتت سووتاوە، ڕەش بوو، وەک زوخاڵ
چاوی مەستت داپۆشیوە، وێڵ و وەحشی کردو، وم
قەت بەقەد ذەڕڕەم نەماوە عەقڵ و ایدراک و کەماڵ
سەقفی چاوم باڕشی غەم، وای لەسەر گۆل بەستووە
خوێن بەخوڕ لێی دادەچۆڕێ وەک تکەی وێرانە ماڵ
وەصلی تۆ (یحی العظام)ەی قالبی فەرسوودەمە
سا مەیێڵە تووخودا شاد بێ بەگەردم بای شەماڵ
ئاسکی صەحرایی چینی بۆ نیگا و وەستان و ڕەو
کەبکی کۆهی زابولستانی بە لەنجە و خەطط و خاڵ
دولبەری وا بە کەماڵ و عەقڵ و دانش کەم هەیە
وام دەزانی بێ کەماڵە، چونکی طیفلە و خوردەساڵ
ئەی طەبیب ئەر تۆ تەماتە زامی دەردم چارەکەی؟؟
تا کە گەرماوگەرمە بۆی پەیدا بکە، شەهدی ویصاڵ
عاشقی خۆشە، نەوەک بۆ منی غەریب و قوڕبەسەر
دولبەرم وەک دوژمن و خۆم بێکەس و ئاشوفتە حاڵ
قافڵەی فیکرم بە تاراجی غەمی (هیجری) چووە،
بۆیە (کوردی) وا دوکانی دڵ لە مەعنا بوو بەتاڵ





## فەلەک ڕەحمێ

فەلەک ڕەحمێ بەحاڵم کە، بەغایەت دڵ پەرێشانم
ڕەهەندەی زێد و مەسکەن، دوور، لە یار و قەوم و خوێشانم
دەڵێن میهمان پەزیر و دڵنەواز و صاحیب ئیکرامی
دەسا بۆ کێتە وا من بێ نەدا و دووریش و مهمانم
چ میننەت؟ گەر نەوازشت و تەعاروف کەی لەگەڵ مونعیم
بەمن فهرچە کە ڕووت و موستەحەقی خەیر و ئیحسانم
عەزیز و خۆشەویستی کوللی عالەم بووم ئەمێستاکە،
غەریب و بێ کەس و تەنها نووشینی کونجی ئەحزانم.
کەسەر داغە لەسەر داغان، گونەهبار نیم و دەشزانیت
گونەهباریش لە ئینعامدایە، هێشتا من بەتاوانم
بە ئەشکی بێ گوناهی گەر بشۆم صەد جار تەن و ڕەختم،
لە گەردی توهمەتی دوشمن مونەززەهـ، نابێ دامانم.
ئەگەر ببێت (موحتەسیب) بیشم کوژێ حەتتا وەکو یوسف
وەریدی عەشق و ڕێشی توهمەت و چاکی گرێبانم
لەبەر جەور و جەفا و هیجران نییە ناڵە و فیغانی من
هیلاکی لەوم و طەعنەی ناکەس و خەندەی ڕەقیبانم
ئەگەرچی لۆنگی دەروێشیم نییە جانا بیحەمدیللا
لەئیقلیمی وەفا و موڵکی موحیبەت شاهی شاهانم
لە (جەوهەر) گەر تەماشا کەن، دەزانن، چۆنە ئەحواڵم
((لە ژێر خاشاکەوە چون گەوهەرێک نوقمی بن ئاوانم))
ئەگەر (هیجری) دەپرسن مەزهەب و پیری تەریقی من
(عەلی) مەولامە (قادر) پیرمە (مەحموود)ە سوڵتانم

## تاکی دڵ مابێ

تاکی دڵ مابێ، مەکۆشە، قەت لە ئابڕوو بردنم
عەشق تا خۆش بێ، مەکێشە ڕەنجی ڕیسوا کردنم
پێشەوای کاروانی بێ ڕەحمی، هەتا ماوی ئەتۆی
هەڵگری باری جەفا و هیجران هەتا دەمرم منم
هەر لە تۆم دیوە لە خۆم دڵسۆز و موشفیق تر بەخۆم
چونکە وا ساعی و عەجوول و تالیبی بۆ مردنم
خۆ نواندن بەس بێ بەخوا ڕووی جیهان زانی کە تۆ
قادری بۆ کوشتن و تالان و زەجر و گرتنم
نازە، یاخۆ مەیلە، یا نەشئەت تلووعی کردووە
یا بە هۆشیاری، دەکەی مەستیی، بەهانەی کوشتنم

تینوویی نەزعی فیراق و یادی جوللابی لەبت
جبرەئیل یارم بێ، یاز ئیشکا لە ڕۆح دەربردنم
بەخت یەکە، هیجرەت دووە، غوربەت سییان و دڵ چوار
من یەکم، چوار تەوقی ناحەق بۆچی چووەتە گەردنم؟
گەر لە عەشقی سادە ڕوویان دڵ بگۆڕم، بێ گومان،
موڕتەدم، یەعنی ئەسیری زوڵف و پوستانی ژنم
دڵ دەڵێ (کوردی)! ڕەقیب دوشمنتە کۆنە لۆتییە
بۆیە وای گوت، تا، نەزانم کێیە دۆست و دوشمنم

## چاوەکەم



چاوەکەم خۆ من برینداری خەدەنگی چاوی تۆم،
زار و بیمار و گرفتاری کەمەند و داوی تۆم
وێڵ و سەرگەردان و خوار و عاجز و ئاشوفتە حاڵ
دڵ بە تالانچووی سوپای کاکۆڵی تێکئالاوی تۆم
گەر دەپرسی داد و گریان و فیغانم بۆ چییە؟؟
ڕاستە ئازیز مردە نیم، ئەمما جگەر سووتاوی تۆم
صەد کە تۆ فیکری ئەسیری خۆت نییە ئەمما ئەمن
خوا دەزانێ، خۆ کە ڕۆژ (بێ خورد)و شەو (بێ خاو)ی تۆ
من لەبەر پیری قەدم خەم نەبووە گەر باوەڕ دەکەی
قەد خەمیدەی فیرقەتی باڵای وەکو لاولاوی تۆم
قاتیلی من کەس نییە، بوختانی ناحەق بۆچ بکەم؟
من شەهیدی خەنجەری موژگانی تازە ساوی تۆم
هەر کەسە، عەبد و موریدی مورشدێکە سا ئەمن
هەروەکو (هیجری) مرید و جانفیدای هەمناوی تۆم

## صەدای کاروانی فیرقەت دێ

صەدای کاروانی فیرقەت دێ، دەڵێن سەرقافڵەچی یارە
زڕەی پێشەنگی هیجرەت دێ، مەگەر کاڵای خەم بارە
ترنگەی تەپڵی باز ئاتڵانی چاوەش دەنگی جارچی، دێ
بەتیپی غەم دەڵێن: نامەرد، ئەسەر دڵ ئەمڕۆ ئێلغارە
دەڵێی ئەسپی فیراق سمکۆڵ دەکا، وا لێڵە بینایی
دەڵێی (تەپڵی تفاق)یان ژەند، کەوا گوێم پڕ لە هاوارە
عەجەب دەرناچێ ڕۆحم، شاهە، شاماتە بەری کۆچی
دەڵێی (شام)ە (نەهار)ی چونکە بێ سەردارە ئەم شارە
خودایا ڕێحلەتی شاد و سەعاتی ڕێجعەتی زوو بێ
بە لوتفی خۆت، بە تەوفیق و بەخێری گێڕی، ئەم کارە
لەکوێی بێنم ئێتر صەبر و قەرار و تاقەت و ئولفەت؟؟



که یارم دەربەدەر، دۆستان هەموو بێ سەر، دڵ ئاوارە
سەبەبکارمان، موعەییەن ڕووڕەش و سەرشۆڕە، ڕۆی مەحشەر
خودا بیکاتە ڕیسوا و پەندی میللەت هەرچی بەدکارە
هیوایەکم بە شەیتان گەر ببێ؟ ئومێد بە تورک ناکەم
ئەوا تۆش چوویت و من چ بکەم؟ کە ڕا هەر ڕای موختارە
لەپێش بەیداخی شادیی، یار، ئەوا ئەسپی دەئاخێوێ
لەپشت تیپی سوپاسالارەوە، پێش بەندو دۆندارە
ئیتر سوارە و تفاق و دەستوپێوەندە بە دوویاندا.
بەتیلاییش ئەوی سەیریان بکا جەرگی دەبێ پارە
مەظننە هەوری میحنەت ئاسمانی عوشرەتی پۆشا
 کەوا ڕۆژی ڕووناک ئەمڕۆ، لەبەرچاوم شەوی تارە
ئەمان سەرقافڵەچیی کاروان، دەخیل سەرچەرخەچیی لەشکر
جڵەو هەڵکێشە، ڕەحمێ کە، کە جارێکە و هەر ئەمجارە
دەبا تێر پڕ بە دڵ سەیرتان بکەم چونکە یەقینە لام
بەبێ ئێوە منیش دەمرم لە دەست ئەم چەرخە بێ بارە
ئەوا ئێوە دەڕۆن حەق بێ بەپارێزگارتان ئەمما
بەکێی دەسپێرن ئێوە توو خوداتان، ئەم بریندارە
کە ڕۆین تووخودا کێ بێتە سەر ناڵین و باڵینی
کە بمرێ کێ هەڵیگرێ و دەفنی کا، ئەم موردە بێچارە
ئەگەر نایبەن لەگەڵ خۆتان بە کوشتن سا عیلاجی کەن
کە وەڵڵا ئەو لەپاش ئێوە لە ڕۆحی خۆشی بێزارە
بەوەڵڵا حاجەتی قەتڵی نییە هیجرانتان مەرگە،
چ فایدە، هەروەکو (کوردی) ئەویش گیان سەخت و بێعارە.

## لە دووری

لە دووریی (توتیا)ی خاکی قەدەمگات، دیدە بێ نوورە
لە تینووێتیی لەبی لەعلت دڵی دێوانە مەخموورە
شەهەنشاهی خەیاڵت، مەجلیسی بەزمی لەتەن دانا
دڵم ڕەققاسە، سینەم چەنگە، ناڵەم ساز و سەمتوورە
خەیاڵت پێی نەزانی عاشقی تۆم تاکو دوور کەوتم
بەڵێ ئێستا لە سایەی هیجرتا ئەو عەشقە مەشهوورە
گوتم: ئینصاف بکە، تاکەی ئەسیری چاهی دووریت بم؟
وتی: هەی قوڕ بەسەر، عاشق هەمیشە زار و مەحجوورە
لە موڵکی دڵ، ئەگەرچی باری کرد شادی، بڵێ: ئەمما
لە سای خەیلی غەما ئێستا لە جاران زێدە مەعموورە
دەڵێ واعیظە: وەرە، لەم دولبەرە دەست هەڵگرە، پێم گوت:
نەفامی خەر، ئەتو نازانی (بێ عەهدی لە دین دوورە)؟؟
لە (تازی) و (تورک) و (فارس) وێنەیی یارت نییە (کوردی)
لەچاوی بەد خودا حیفزی بکا بیللا دەڵێی حوورە

## ڕۆحی خۆم لێ زویرە

ڕۆحی خۆم لێ زویرە دائیم، بۆیە وا زاری دەکا
ئای چ بێزارە بەزار، فریادی بیماری دەکا
(ڕۆح) کەیار و هاوسەری (دڵ) بوو فڕاندت، (شین)ییە
ئارێ، ئارێ حەقیەتی، ئەو مەیلی هاوشاری دەکا
هەر شەوێ وەعدەی ویصالت بێ؟ هەتا ڕۆژ ناسرەوم
لەیلەتولقەدرە، هەموو کەس حەز بە بێداری دەکا
دڵ لە قاپی تۆیە، وریای هەر کەسێکە بێتە لات
چوون، غەریب و کەس نەناس، مەشقی هوشیاری دەکا
چاوەکەت بۆ قەتڵی من هیچ ڕەحم و ئەندێشەی نییە
حاکمێ مەست بێ، هەمیشە مەیلی غەدداری دەکات
عیللەتی بێ ئیلتیفاتیی تۆیە ناڵەی سۆزشم
باعیسی شەرمی گوڵە، بولبول کەوا: (زاری دەکا)
(کوردی) مەستی دوردی بادەی عەشقە ویردی نەظمی ورد
دەردی هیجرە گەر بە حەرفی کوردی هەر یاری دەکا

## ئەی ڕەفیقان

ئەی ڕەفیقان، بێن بە خەنجەر بمکوژن ئێوە و خودا
تا، خەلاصیم بێ لەدەس هیجرانی یاری بێ وەفا
تووشی یارێ هاتو، وم سەححار و دوزد و حیلەباز
تورک ڕەفتارو طەبیعەت کافر و صۆفی نوما
من وەهام زانی کە ئاهوو، کەوتە داوم، ئێستەکە
خۆم خەلاص نابم، لە داو، کەوتوومە ناو چاهی بەڵا
هات بەعەییاری دڵی لێم ساند و ئێستەش پێم دەڵێ
من لەکوێ تۆم دیوە هەی پەتیارە لاچۆ لێرە، سا
دێم، بچم بیبینم ئەو دەڕوا بە یارانی دەڵێ:
کەس سڵاوی لێ نەکا، دوور بێ لە جەمعی ئێمە با
ئەز دەڵێم قوربان، دەڵێ: من صاحب الصوت الکریە
غەیرکە بانگی کا، دەڵێ: لبیک یا خیر الندا
ڕووی هەزار داد و (فیغان)ی تێ دەکەم لێم نابیەت
سەنگدڵ، ئاخر بەحاڵی من، تەڕەحوم کەی دەکا؟
گەر ڕەقیب لالووت ئیشارێکی بکا گاهێ لە دوور
هەڵدەسێ چەسپان بەسەر شانیا دەدا جەڵدی عەبا
بەختی (کوردی) نەحس و دڵ بێ صەبرو، لەیلا بێ وەفا
ئەی خودا ڕۆ، دڵ وەها، طالع وەسا، جانانەوا.



# هەڵبەستی (کوردی) بە شێوەزاری گۆران

**ئەم هەڵبەستانەی مستەفا بەگی کوردی بە شێوە زاری گۆران لەلایەن مامۆستا محەمەد مستەفا ( حەمەبۆر ) ساغکراوەتەوە و پەراوێزی بۆ نووسیووە و ماناى وشەکانی لێکداوەتەوە و لە دیوانێکی دوو بەرگیدا لە ساڵی 2010 لە دەزگای ئاراس لە هەولێر چاپ کراوە**

**( ڕۆڤار )**

**صەیدی مەزانان**
**( صەیدی ) مەزانان، ( صەیدی ) مەزانان**
**مە بۆ بزانان، کۆمەندەن جانان**
**یەقین جە عەشقی یاران ڕەم کەردەی**
**وەرنە، چین عیللەت لێوەنێی هەردەی؟**
**ئازیزم حەیفەن یادت کەم بییەن**
**مەگەر دەرد عشق جەیادت شییەن**
**من جە دلی زار، ئەی چەند فەردەوە**
**یاد، دیرینەم نۆژەن کەردەوە**
**ئەبیات عیشقەت، گەر ( گەزاف ) نییەن؟**
**دەلیل لوتف وەرینەت چییەن؟**
**پەی چێش گوم کەردی هەم فەرد جاران**
**هورێزە وەپا چون کاروانداران**
**قەدەم ڕەنجەکە، گەر زەدەی هیجری**
**خەیلێ مۆشتاقی ( دیا ) تەن ( هیجری )**[1]

1- (صەیدی): مەبەست لە شاعیری مەزن (صەیدی)یە، کە ئەم (وشە)یە نازناوی ئەو شاعیر بووە و ناوی خۆی مامۆستا مەلا سەید (محەمەد) کوڕی مەلا (سلێمان)ی کوڕی مامۆستا (حاجی سەید ئەحمەد)، لە نێوان ساڵانی (1848-1784ز)دا ژیاوە و لە خەڵکی (هەورامانی تەخت) بووە.
من ئەو هەڵبەستەی سەرەوەم لە سێ سەرچاوەوە دەست کەوتووە:
سەرچاوەی یەکەمیان، کەشکۆڵەکەی (مس)ە کە سەرەتایەکەی دەستنووسی خودی (صەیدی دووەم)و پەری سپیی تری لەگەڵدا (جزوبەند) کراوە و نەوەکانی ئەو (صەیدی دووەم)ە، بە دەسنووسی خۆیان کام هەڵبەستەیان ئارەزوو لێ بووبێ، ئاوێتەی ئەو کەشکۆڵەیان کردووە.
ئەم هەڵبەستەی سەرەوە کە بریتییە لە نامەیەکی برادەرانەی (کوردی) کە لە (هەورامانی تەخت) بووە بۆ (صەیدی دووەم) هاوەڵی خۆی ناردووە کە دیدەنیی (کوردی) بکات.
هەر لەم کەشکۆڵە سەرچاوەیەمدا هەڵبەستێکی تری تێدایە کە وەڵامی ئەم نامە هەڵبەستەی سەرەوەیە کە هی (صەیدی دووەم) و بۆ (کوردی)ی برادەری خۆی داناوە.
ئەم سەرچاوەی (مس)ە، یەکێکە لە هەرە سەرچاوە گرنگ و بایەخدارەکانی ئەم پەراوییەم کە شوێنی بروا و بەڵگەنامەیەکی بەهێزە.
ئەم هەڵبەستەی سەرەوە (تاسەنامە)ی شاعیر (کوردی) و گازندە کردنێتی لە (صەیدی دووەم)ی برادەری و خۆشەویستی. هەر ئەم هەڵبەستە لە لاپەرە (205)ی دیوانە چاپکراوەکەی (صەیدی)دا لە دوای تەواوکردنی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یەوە ئەو (وەڵام)ەیش پێشکەش دەکەم.
ئەمیش لێکدانەوەی وشەکانی ئەم تاکی یەکەمەیە:
مەزانان: نازانی؟
مە بۆ: ئایا نابێت؟
بزانان: بزانی، بزانن؟
کوو: لەکوێ؟
مەندەن: ماوە؟ ماونەتەوە، مەبەستی (لەکوێران)ە.
جانان: گیانان-کە مەبەست لەدۆست و برادەرانە.
2- یەقین: بەڕاستی، بێگومان.
جە: لە.
عشقی: خۆشەویستی، ئەڤینی.
یاران: دۆستان، برادەران، هاوەڵان.
ڕەم: ڕەو، سڵ، هەڵاتن، دوورکەوتنەوە.
کەردەی: کردووتە، واتە: ڕەوت کردووە.
وەرنە: ئەگەرنا، ئەرنە.
چین: چییە، چی شتێکە، هۆی چییە، لەبەر چین.
عیللەت: هۆ، سەبەب.

لێوەن: شێت، دێوانە، هەردەوێڵ.
هەردەی: بە هەردەوەی، داوتەتە کەژ و کێو.
مەبەستی دوورییەتییە لە یاران و لە خۆی (کوردی).
هەردە: دەشت و دەر و شاخ.
سەرچاوەیەکی ئەم پارچە هەڵبەستە کەشکۆڵی (ن)ە، کە ئەمیش یەکێکە لە دەسنووسە چاك و باوەڕپێکراوەکان کە ئەم هەڵبەستەی (کوردی)م لێ وەرگرتووە و وەڵامەکەی (صەیدی)م تێدا نەدیوە.
لەجیاوازییەکانی تاکی یەکەم:
کۆمەندن (مس) کمندن.
مەزانەن (مس) بزان کوژاوەتەوە.
3- ئازیزم: عەزیزەکەم، خۆشەویستەکەم.
حەیفەن: موخابنە، جێگەی داخە.
یادت کەم بییەن (یادت کەم بییەن): یادت کەم بووەتەوە.
مەگەر دەرد عشق: مەگەر دەرد و ئازار و ناخۆشی دڵداری و خۆشەویستی.
جەیادت شییەن: لە یادت (بیرت) چووە.
حەیفەن (مس): حیفن.
بییەن (مس): بین.
شییەن (مس): شین.
4- من جە دڵی زار: من لە قووڵایی دڵی (دەروونی) پڕ تاسە و دەردی یادکردنەوەی تۆدا، لە دوورویی تۆی خۆشەویستەوە.
ئەی چەند فەردەوە: ئەم چەند تاکە هەڵبەستەمەوە.
یاد دێرینەم: یادی تۆم کردووەتەوە بەم هەڵبەستەم کە یادی کۆنەی دۆستایەتی نێوان من و تۆ وەك جاران لە نێوانماندا گەرم و گوڕ بوو.
نۆژەن کەردەوە: نوێم کردەوە، تازەم کردەوە، واتە نوێکردنەوەی دۆستایەتییە کۆنەکەمان.
فەردەوە (مس): فردوە
نۆژەن کردەوە (مس) نۆژن کردوە.
دێرینەم (مس)دیرینەم.
5- ئەبیات عیشقەت: تاکە هەڵبەستەکانی خۆشەویستیت کە دات نابوون، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە (صەیدی) بەر لەم نووسینی نامەیەی (کوردی) هەڵبەستی خۆشەویستی بۆ (کوردی) ناردووە کە بەداخەوە ئەو هەڵبەستە و ئەو هەڵبەستەی تری (صەیدی)م بۆ (کوردی) دەست نەکەوتوون.
گەزاف نییەن: درۆ نین: واتە ئەو هەڵبەستە (تاسەنامە) یانەی تۆ بۆ من ئەگەر ئەوانە درۆ نین-درۆ نەبوون؟
گەزاف: درۆ، ناراست، خۆهەڵکێشان.
نییەن: نین، نەبوون.
دەلیل لوتف: بەڵگەی دڵسۆزی، چاودێری، لاواندنەوە، خۆشەویستی پیشاندان.
وەرینەت چییەن: لەمەوبەرت، دێرینەت، رابردووت مەبەستی لە نامە هۆنراوەییەکانی پێشووی (صەیدی)یە بۆ (کوردی).
وەرین: پێشوو، جاران، رابردوو، زۆر کۆن
گەر گەزاف (مس): کرکزاف= ئەمە ڕێنووسی کۆنە.
وەرینت: ورینت.
6- پەی لەبەر بۆچی لەبەر چی، بۆ.
چێش: چی
گوم کەردی: بزرت کرد، گومت کرد، لە بیرت کرد، بیرت چووەتەوە.
هەم فەرد جاران: هاو هۆنەرییەکەی جاران، ئەو کەسەی کە جاران هەڵبەستیان (تاسەنامە)یان بۆ یەکتر دەنارد کە من (کوردی)و تۆ (صەیدی) بووین.
هەم فەرد: هاواڵ، هاوهۆنەری، هاودەم.
هورێزە وەپا: رابە، هەڵسەرە سەرپێ، راپەرە، راست بەرەوە، مەبەستی لەوەیە کە ئەی (صەیدی) زووکە و هەڵسە و وەرە بۆ لام.
چۆن کاروانداران: (ئەو (رابوون)ەت و هاتنە لای منەت وەك کاروانچییەکان روو بکەرە لام سەرم بدە، دیدەنیم بکە.
چون: وەك.
کاروانداران: کاروانچییان.
پەی چێش (مس): پی چیش.
گوم کەردی (مس): کومکردی.
هەمفەرد (مس): همفرد.
هورێزەوە پا (مس): هوریزە وپا.
7- قەدەم ڕەنجەکە: قەدەم، پێ، قاچ، لاق.
ڕەنجە: ئازار، ماندوو، پەشاندن.
قەدەم ڕەنجەکە، پێی خۆت ئازار بدە، ماندوو بکە- لە ڕێگەی هاتنتا ئەی (صەیدی) بۆ لای من (کوردی).



**ئەمیش هەڵبەستە وەڵامەکەی ( صەیدی )یە بۆ ( کوردی ) :**

**هیجری نەزانان، هیجری نەزانان**
**تۆ بە حاڵی دەردی ئێمەت نەزانان.**
**من ( صەیدی ) سەردار سوپای دیوانان**
**کوشتەی دەردی عشق زەدەی هیجرانان**
**تا وانام ( کتاب ) دەرسی عشقم وەند**
**مۆری دل بەسەجع، نابی عەشقم کەند**
**جە مەکتە بخانان، تاقە مەشقم کەرد.**
**عالەم مەزانان مەشقی عەشقم کەرد.**
**تاکە ( جوان )بیم، نەسەودای یار بیم**
**هەدای عەشقم بی ( پەوچی ) سادار بیم**
**بەسادار، عەشق یاوام بە پیری**
**ئەصلا رام نەکەوت من وەلای ژیری**
**وەهاری عومرم، جوانیم ویەرد.**
**گاچەنی هیجران گا بەداخ و دەرد**
**هەر شێت و سادار بیابان گێل بیم**
**چمان من جادار، مەجنوونی وێل بیم**
**( صەیدی ) تا زیندەن، چەتۆی دەردەوە**
**بوون مەجنوون وێڵەن بەرووی هەردەوە.** [2]

---

گەر زەدەی هیجری: گەر: ئەگەر

زەدە: ئەنگاوتە، پێکراو، لێدراو- هیجری: دووری، گەر زەدەی هیجری، واتە فەرموو بۆ لای من، ئەگەر تۆ ئەنگاوتەی ئازاری دووربوونەوەیت-یا- دووریت لەمن.

خەیلێ: زۆر (حەیلی)ش دەبێت.

موشتاقی دیاتەن: ئارەزوومەندی دیدار (دیەت) چاوپێکەوتن و بەیەکگەیشتن وەك من چۆن ئارەزوومەندی دیدارتم.

دیاتەن: دیدەنی تۆ، دیدار و چاوپێکەوتنی تۆ.

هیجری: ئەم وشەیە لە نێوان باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەست (دووری) و (جیایی)یە و لەم نێو باڵی دووەمیشدا مەبەست لە یەکێ لە دوو (نازناو)ەکەی شاعیرمان (کوردی)یە.

قەدەم (مس): قدم.

رەنجە (مس) رنجە.

زەدەی (مس): زدی

موشتاقی دیاتەن (مس) مشتاق دیاتن.

لێرەدا پێشکەشکردنی (تاسەنامە)کەی کوردی بە لێکدانەوە و بەراوردکاری و لەسەر دواندنییەوە کۆتایی هات و نۆرەی پێشکەشکردنی وەڵامەکەی (صەیدی دووەم)ە بۆ کوردی شێوەزاری گۆران.

سەرچاوەی ئەم وەڵامەش (مس)ە کە خودی (صەیدی) بە دەسنووسی خۆی لەم کەشکۆڵی (مس)ەدا و بە دەسنووسی خۆی نووسیویەتیەوە.

لەو دیوانە چاپکراوەدا هەڵبەستەکەی (کوردی) نەنووسراوە، کەوا دیارە (مامۆستا کاردۆخی) یا دەستی نەکەوتووە، یا چاپکردنی بە پێویست نەزانیوە و کەمێك شتێکی لەبارەیەوە راگەیاندووە کە گوایە (صەیدی) (20)ساڵ لە (کوردی) بە تەمەنتر بووە، بەڵام وەك خۆی بۆی ساغ بووەتەوە کە (کوردی) (دوو ساڵ) لە (صەیدی) گەورەتر بووە.

3- (واتە: تا توانیم پەراوی دەرسی عەشقم خوێندەوە و عەشقم وەك مۆر لەسەر دڵم هەڵکەند)

4- (واتە: لە خوێندنگەکاندا مەشقی عەشقم کردووە و هەمووش ئەمە دەزانن)

5- (واتە: هەتا گەنج بووم لە پەیکاری عەشق بووم بۆیە وێڵی (پەوچی) شوێنان بووم).

6- (واتە: بەهۆی عەشقەوە مامەوە هەتا پیر بووم، لە ژیانما رێم نەکەوت بەلای ژیرییەوە).

7- ویەرد: تێ پەڕی.

چەنی: لەگەڵ

8- چمان: چونکە.

جادار: جێنشین.

# مستەفا بەگی کوردی لە ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی

ئەمە دوو دەستنووسە تایبەتە بە شیعر و ژیاننامەی مستەفا بەگی کوردی، کە لە ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) لە ژمارە٢١ی ١٨ ئازاری ساڵی ١٩١٨ بڵاوکراوەتەوە، لەم دوو نووسینە پوختەدا ژیاننامەی مستەفا بەگی کوردی و پوختەی نموونەی شیعرێکی ئەو شاعیرە و کورتەیەک لەسەر ژیاننامە و شێوازی شیعرنووسینی مستەفا بەگی کوردی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە لە عێراقدا کە لە ساڵی ١٩١٨-١٩١٩ لەسەردەمی شێخ مەحمودی نەمردا بڵاوبووەتەوە، تا ئێستا نازانرێت کێ سەرنووسەری بووە، بەڵام بەپێی هەندێ سەرچاوە مێجەر سۆن خۆی سەرپەرشتیاری ئەم ڕۆژنامەیەی کردووە.

**ڕۆڤار**



ادبيات كورد

مصطفى بيك بكيكه له شاعران كورد له خلق (سليمانى) يه لقبى كرديه وبعضاً هجريه لقب اولى دلالت له قوميت پروورى دكا شعره‌كانى زور محزونانه‌يه هر بيتيكى سرچاوه يكى عشقه مشربى وكو (فضولى) وايه اوى آثار او بخوينى دبى هر بكريه بيكه نبى له فكر د چيتوه تماشاى ام دو بيته كن چند محزنه

شهيد عشقمو مشونو كفنم بو مكن ياران
گواهى حشره بو دعواى شهادت برك خوينيم
له پردەى طاهرى كربى صداى يا عاشق يادم
ايتر حاجت نيه بينن ملا بووعظ وتلقينم

اوى ام دو بيته بخوينيتوه چوشش گريانى هلدسى چونكه سوداى محبت لى هلد قلى. شعركه بسائقه‌ى طبيعت بيژرى تأثيرى زور دبى سير كن فراق وغريبى چون تصوير دكا

وها سوتاوم اصلا تاب فريادم نما سادى
رفيقان نيوه سوتون نامرد عرض هاوارى
له ژير بارى غريبى شان صبرم ديته ايستا كه
فراق يار له بر الخرشرى ليم يو بسربارى

ام دو بيته درجه‌ى تأثيرى له‌لاى ارباب ذوق مودت اشكرايه اما له نقطه‌ نظر ادبيات كوردو قيمتيكى كوره‌ى هيه جارى امنده سليسه ومنسجمه الى اوه ديته خوارى تأنيا معناكى امنده واضح وخوش دست بجى ذهن اشغال اكا وتأثيريك دبخشى مصطفى بك بعضاً دكريته وادى وصفوه

اما م نسخه شعرى ...

كو ادارى زر كورتك كرچين جبه كلنارى
كلاو لار چاوخمار شرين سوار خال مشك تاتارى
كانى هاته سر كيشانى ابروى تولباش چاوت
له مستى دستى وا الفزى كه كچ هات خط پركارى

ام دو بيته زور نتشه بخشه ظاهراً وصف امير زاده يكه اداكى چند محتشمه محبت وعلوتى تيدا نيكه لا و بوه له بيت اولدا هشت وصفى كو كردوتوه له كل امه كه هيج خللى بدوق ادبى نداوه . شبهه نيه كه طبيعتيكى خالص وصاف بى‌دوى . له بيت دومدا معنايكى باريكى اداكردوه كه هيچ ذوق اشنايكى ادب نيه بخويندنى جذبه نيكرى .

شاعريكى فرس الى :

بعد چشم تو مصور چو بابرو پرداخت
شد چنان مست كه بر روى تو شمشير كشيد

واقعاً ام بيته قيمتيكى ادبيه‌ى فوق العاده‌ى هيه اما دهشتى بانسان ادا بيتكى مصطفى بك يعنى - كردى ياخود هجرى لو نازكتره چونكى فنى تصوير كراوه

ام دو بيته‌ى آتى زور خوش وبى باكانه ادا دكا . ... وربكى محبت تيدا جلوه كر دبى

ام خسرو خوبانه كوادبته نظارت
شرينه له لام دل درفينى بمهارت
باكم نيه لو خنجره كردوته بيرتا
شمشير بروت جركى بر يوم بإشارت

بيت اولى امنده نازكه كه لايقه خسرو پرويز بو شر...



—— ادبيات كورد ——

له نسخه‌ى پيشو دا بحث (مصطفى بك) يعنى [كردى] كرا بعضى له منتخبات شعريش نوسر ابو . ام پياوه هم شاعريكى روون نبو . زور قوميت پرور سياستشناس بو له كل امش كه ترككان دست هاويشتوه شارى [سليمانيه] وه‌يان نه‌ده ترسا له رقانا له عليهى ترك وقوم كورد دمبو اما بيزا كت تماشاى ام دو بيته كن .

خبريكم بدەنى اهلى خبر حشره مكر
روژى امرو كه له مغرب سرى هيناوته‌ده‌ر
نورى مهدى له‌طرف مكه‌وه ظاهر بووه يا
غلبه‌ى رومه له بو كوشتنى من كان كفر

همو كوردێك ده زانى كه كورد ترك بروم ناو دبن حتى امروش له كوردستاندا بترك الين (رومى) سبرى ام شاعره كن چون بكنايه قوميت كرد دهينيته هيجان . ترك چونكى له‌غربى سليمانيه‌وه هاتن استيلاى اوان بروژ حشر تشبيه دكا ومناوبيت لايق به كوردان نا بينى . بوهن بيان الى خوايوه كافرين . ترك جارى بروژ جارى بنور مهدى ناودبا يعنى بوچى والانان كوره‌بون اماله دو مصرع تأنيدا شرينه وبيكى عجيب دكا . والحاصل ام دو بيته بلاغتيكى چاك لى ددروشيتوه . وبو وطنپرورى (كردى) دليليكى كوره‌يه .

(كردى) شعر تركى وعربى وفارسيش هيه اما تركى وعربيه‌يكى قيمتيكى ادبيه‌ى نيه تركيب بنديكى فارسى هيه صوفى مشربانه‌يه .

—— ترجمه‌ى حال كردى ——

كردى مصطفى بك له‌بكزاده‌كانى سليمانيه تاريخ ولادتى اووفاتى نوسراوه اما وكوله آثارى دفام بيتوه له اثناى استيلاى ترك زياده حتا هشتا صال لمويش حياتى شعرى دستى پى كردوه .

ام شاعره وكو غلدكرى عاشقيكى پاك بووه ومحبوبيكى حظ لى كردوه كه امنده جوانى نبوه له‌پاش مدتى محبت تأثيرى نى دكا ووكو مجنون دكويته دشت وكيوى كوردستان له اطراف سنه وسابلاغ چند صال روت وپريشان دكرى

